




# چارەسەری نەخۆشی بەگوڵ و گیا

ئامادەکردنی
فائق محمد نادری




---

**ناوی کتێب : چارەسەرکردنی نەخۆشی بەگوڵ و گیا**

**ناوی نووسەر : فایق محمد نادر**

**نۆبەتی چاپ : چاپی یەکەم**

**تیراژ : ( ٧٥٠ ) دانە**

**ژمارەی سپاردن : (٤٥٧) ی پێ دراوە لەلایەن وەزارەتی رۆشنبیرییەوە**

# چمکێك لە ژیاننامەی نووسەر

من کە ناوم (فایەق محمد نادری)ە خەڵکی گوندی (سردۆش)م سەر بە شاری مەریوان لە کوردستانی رۆژهەلات هەر لە تەمەنی منالی‌یەوە کە هۆشم پەیدا کردووە حەزم بە خزمەتی مرۆڤایەتی و نیشتمان پەروەری ئەکرد هاونیشتمانان و هەمو دۆستانم خۆش دەویست حەزم کرد بە رێگایەکی دڵسۆزانە و زانیاریانە و شیاو وەك رێگای (طب)ی گیایی‌یەوە خزمەت بکەم

**ئاشنا بونی من لەگەل گیادەرمانی‌یە شیفا بەخشەکان:**

لە تەمەنی (١٢)ساڵیدا بە دڵ خۆشحاڵ بوم کە لە حەکیمە کوردە نەتەوایەتیەکانی خۆمان نزیك بمەوە هەروەها لە باوك و باپیران و عالمە بە تجربەکان و شارەزایانی ئەم بوارە کەڵك وەرگرم وە ئەمزانی کە لە ناو دڵیاندا چەند دەنکە گەوهەر و مرواریەك هەیە کە منیش بێ بەش نەبم لێی و کەڵکم لێ وەرگرت وە گوێم بۆ ئامۆژگاری و رێنمونی و زانیاری‌یەکانیان رادەگرت وە لە هەر شوێنێك باسی کتێبێکیان بۆ بکردمایە سەبارەت بە گوڵ و گیاو دەرمان ئەوا بە تاسەوە خۆم بەو کتێبە دەگەیاند و گژوگیا و گوڵ و دەرمانەکانم ئەدۆزیەوە لەهەر جێگەیەك بم بیستایە کە حەکیمێك هەیە سەردانم ئەکرد و بە پەرۆشەوە گوێم بۆ ئامۆژگاریەکانی ئەگرت و کەڵکم لێ وەرئەگرت هەر لەو کاتەوە کە دەستم بە ناسینی گیاو دەرمان کرد تا تەمەنی (٢٥)ساڵی لەسەر نەخۆش و دروست بونی نەخۆش لە مرۆڤدا دەستم بە خوێندنەوە کرد ، لە کتێبە بەرزو بە نرخەکانی مامۆستای گەورە و ناودار (ابو علی سینا)وە مامۆستای گەورە (زکریای رازي)وە لە رێبازی مامۆستای گەورەو بەرێز(لقمانی حەکیم) وە مامۆستای پایەبەرزی کورد (شێخ سراج الدین )ی بیارە .

کاتێك دەستم بە خزمەت کرد لە رێگای دەرمانگەری گیایی‌یەوە لەگەڵ ئەو گژو گیا و گوڵە شفا بەخشانە ئاشنا بوم کە هەر گوڵێك لە شاخێکی وە هەر گیایەك لە دۆڵێك کاتێك دەرمانم لێ دروست ئەکردن پێش ئەوەی بیدەم بە خەڵك یان نەخۆشەکە لەسەر گیان و لەشی خۆم تاقیم دەکردەوە بۆ ئەوەی دڵنیا بم کە ئەو دەرمانە زیانی بۆ کەسی تێدا نیە سود بەخشە کاتێك کە ئاشنا بوم بە دەرمانی گژو گیا و گوڵ خزمەتم بە هاونیشتمانە هەژارەکان‌و مرۆڤە نەخۆشە دڵشکاوەکان ئەکرد کاتێك نەخۆشەکان کەڵکیان لێ وەردەگرت و چاك دەبونەوە زۆر زۆر خۆشحاڵ دەبوم زیاتر هەستم بە دڵسۆزی دەکرد کە پەرە بە کارو پیشەکەی خۆم بدەم وە هەستم بە ماندو بوون نەدەکرد لە خوای مەزن بە زیا بێ کە من دەتوانم لەم بوارەدا خزمەت بە چینی چەوساوە و هەژارەکان بکەم بە شانازی‌یەوە . بەڵام

بە داخەوە کە کەسێك یان لایەنێك یان کاربەدەستێك کە دەستی یارمەتیم بۆ درێژ بکات و پشت گیریم بکات بۆ ئەوەی کە مۆڵەتم پێ بدرێت کە لە بواری حەکیمی دا پەرە بەکارەکەم بدەم بە بێ خەم وە بتوانین لەگەڵ ئەو برادەرە حەکیمە شارەزایانەی کوردستانی باشور پێکەوە کۆمەڵەیەکی حەکیمی باشی شارەزا دابمەزرێنین و سەندیکایەك بۆخۆمان دروست بکەین بۆ ئەوەی پەرە بەکارو چالاکی دەرمان سازییەکەی خۆمان بدەین و کەڵکی زیاتر و سودی باشتر بگەیەنینە میللەتەکەی خۆمان ، هەرچەندە من پشت بە خوا گەلێك کەسم بە دەرمانی گوڵ و گیا چاك کردوەتەوە دوای ئەوەی خوای گەورە شفای دان .بەڵام تا ئێستا هیچ دەستگاو تەلەفزیون و رادیۆیەك چاو پێکەوتنی لەگەڵ من نەکردووە تەنها رۆژنامەی (ڕێبازی ئازادی)سەر بە حیزبی سۆشیالیستی بەڕێز ئەبێ کە لە بەرواری (١٩٩٨/١٢/١٥)دا لەلایەن رۆژنامەی ئاو برلو بەمۆی بەڕێز کاك حەمید رەشید فەرج کە هەواڵ نێری حزبی سۆشیالیستی کوردستانە منی بە گەل کوردستان ئاساند زۆر سوپاسی ئەکەم برای بەڕێزو خۆشەویستم کاك هادی جعفر علی فەرمانبەرە لە زراعە دانیشتوی شاری سلیمانییە کە زۆر دڵسۆزو نیشتمان پەروەرە لە (١٩٩٨/٢/١٥) پێشنیاری کرد کە کتێبێك دەر بکەم لەسەر چارەسەری نەخۆشییەکان بە دەرمانی گژو گیا و گوڵ و بۆ ئەوەی ببێتە خەزنەیەك بۆ گەل کوردەنەوەی دواڕۆژ کەڵکی لێوە بگرێت و ئەو شارەزای و زانیاریانەی کە هەمە سەبارەت بە دەرمان گەری و حەکیمی پێش کەش بە فەرهەنگی نەتەوەیی کورد بکرێت چونکە ئارەزووی کۆکردنەوەی زانیاری بو خولیای شارەزابونی زانیاری گژو گیا و گوڵ و دەرمان بووە زۆر هانی دام و هەوڵیدا لەگەڵم یارمەتیم بدات کەلەرکی نوسینەوەو پوختەکردنی نوسینەوەکان بکەوێتە ئەستۆی خۆی چونکە من بەزمانی کوردی ئەم خوێندبووە ، زۆر زۆر سوپاسی ئەکەم کە ئەرکی برایانەی خۆی بە جێ هێنا یارمەتی دام و زەحمەتی زۆری لەگەڵ کێشام و هەوڵی نوسینەوە و دەرکردنی کتێبەکەم و بیرۆکەی کتێبەکەی داوە لە گەڵمدانوماندو بووە ، هەروەها کە خەریکی نوسینەوەی ئەم کتێبە بووم برای بەڕێزم کاك عبداللە درویش مفوضی پۆلیس لە بەرواری (١٩٩٨/١٢/٢٠) داوای لێ کردم کە بەردەوام بم لە نوسینەوەی ئەویش بەڵێنی هاوکاری کردنی دامێ زۆر سوپاسی ئەکەم .

من خزمەتم بە نەخۆشە هەژارەکانی شاری سلێمانی و دەوروبەری و شارۆچکەکانی پێنجوێن وسید صادق و کەلار و دەربەندیخان و چەمچەماڵ و چوار قوڕنە و کۆیەو

هەروەها هەرلێر کردوە سودیان لە کارەکەم بینیوە وە ناوی چەند نەخۆشێکتان بۆ نیشان ئەکەم کە کەڵکیان لێ وەرگرتووە بۆ نمونە وەك .

١-کاك بەرزان رەئوف کە منداڵەکەی دەستی سوتا بوو خەڵکی زەرگەتەی کۆن بو ،ئەنجومەنە، کە زانیاریان لە بارەی منەوە هەبو لە خەستەخانەی ئەجنەبی یەکە ئەریان کردو هێنایان بۆلام بە یارمەتی خوای مەزن بە ماوەی (١٠)رۆژ چاك بوو بێ ئەوەی شوێنی برینەکەی دیار بێ و دەستی سەڵەت .

٢-منداڵێکی تەمەن (٧)ساڵ بە ناوی محمد عثمان خەڵکی گوندی میولاکە ژێر قاچی منداڵەکە سوتا بو کە ماوەی (١)مانگ و نیو لە خەستەخانە لجنبی یەکە بوو هێنایان بۆلای من بە یارمەتی خوای مەزن بە ماوەی (١٢)رۆژ بە دەرمانی گوڵ و گیا چاك بووەوە وە هەوەرها بۆ نەخۆشی (داء الثعلب)(دەردە رێوی) کە زۆربەی رۆشنبیران دەزانن چارەسەری چەند گرانە و زەحمەتە ئەنانەت لە دەرەوەی وڵات (ئوروپا) کە من تا ئێستا چەند نەخۆشێکم چاك کردووەتەوە یەکێك لەو نەخۆشانە (شایان احمد کریم) سلێمانی دارۆغا موالید (١٩٧٢) و خوشکی بەڕێز گوڵزار عبد الله گەرمکی ئاشتی سلێمانی ، هەڵۆ زاهیر سلێمانی مریشك فرۆشە لە ژێر پردەکە وە خوشکی بەڕێز ئاورنگ سلێمانی رزگاری سوپاس بۆ خوای مەزن کە یارمەتی داوم بتوانم دڵی ئەم نەخۆشە دڵشکاوانە خۆش بکەم بە هۆی دەرمانی گوڵ گیاوە هەروەها نەخۆشێکی تر بەناوی خێزانی کاك احمد قادر حمە دانیشتوی سلێمانی کانی کوردە کە نەخۆشی ژنانەی هەبو دکتۆر بڕیاری دابو کە نەشتەرگەری بۆ بکات ئەترسا لە عەملیاتەکە بۆیە هێنای بۆلای من بە دەرمان چارەسەر کرا . هەروەها کاك عبداللە وەستا رەسول سلێمانی ، چاوی تانەی سپی کەوتبوە سەر هێنایان بۆلای من عیلاج کرا چاوی چاك بووەوە و ڕوناکی هاتەوە چاوەکانی ، لە برینی بچوك تا گەورە من سودم لە دەرمانی گیای وەرگرتووە .

هاونیشتمانان و برایانی بەڕێز و بە نرخم خوشکانی بەڕێز مرۆڤ دۆستەکان ئەوانەی کە دەیان ویست لەگەڵ گیاو گوڵی دەرمانی سروشتی وڵات ئاشنا بن و کەڵکی لێ وەربگرن کە من لەلایەن خۆمەوە بە ئێوەی بەڕێزی بناسێنم هیوادارم ئەگەر کەم کوڕی هەبێ لێم ببورن چونکە ئۆبەرەی نوسینمە.

بەڕێزان سەرەتا داوا لە بەڕێزتان ئەکەم هەتا بە باشی شارەزای گیاو درەخت و گوڵ و دەرمان نەبن هەر لە خۆتانەوە لەسەر معلوماتی کتێبێك دەرمانگەری ئەکەن و دەرمان بە شارەزایی بەکار بێنن بێجگە لەوە کە گیاو گوڵ و ڕووەك هەیانە سود لە تۆوەکەی

وەرنەگیرێ یان گەڵاکەی یان گوڵەکەی یان تۆوەکەی یان شیرەکەی یان شیلەکەی یان تونکڵەکەی یان لاسک و پەل و و ساقەکەی هەیانە ئەخورێ هەیانە ئەخورێتەوە هەیانە بۆ چەورکردنی جەستەیە هەیانە وەك نیو نەمەك و دەستە نەرمە لێ دەنێ هەیانە دەی سوتێنن و دوکەڵەکەی بەکار دێنن یاخود بەگەڵ شێوەی تر و تایبەت بەکار دێت با توشی زیان نەبن ئێمە مەبەستمان ئاشنا کردنتانە بە بەروبومی سروشتی خوا بە خشی وڵاتە بەرێزەکەمان کە بەکار هێنانی ئەم گژو گیایە ئەگەر بە ڕێگای حەکیمانە بەکار بێت بە هیچ شێوەیەك زیانی نیە ، بەڵکو سود بەخشە وە هیچ کاریگەرییەکی کیمایی بە جێ ناهێڵێت لەناو خوێن و جەستەی مرۆڤدا :

ئازیزان لەسەر پێوزکەی برای دڵسۆز کاك هادی پەرتوکەکەمان کردە دو بەش بەشی یەکەم بەشی دەرمانگەری و چارەسەکردن بەدەرمانی سروشتی بەشی دووەم وەسف وتعریفی گیاو گوڵ و رووەك میوەکانە و خاسیەتەکانی .

**ئاگاداری :- بۆ هەر نەخۆشیەك چەند دەرمانێك ئامادەکراوە بەلام تەنها یەك دەرمانیان بەکار نەهێنرێت لە کاتی چاك نەبوونی نەخۆشەکەدا دەرمانێکی تر بەکار دەهێنی.**

## زیبکە یان دومەڵ

ئەگەر لەشی مرۆڤ نەتوانێت لە ڕێگای گەدەو گورچیلە و پێستەوە ئەو چەوری‌یە زیادەو میکرۆبە پیسانە فڕێ بداتە دەرەوە ئەوا کۆ دەبێتەوە لە شوێنێکی جەستەی مرۆڤەوە دەردەکەوێت .

● چارەسەرکردن/گەڵێ ڕێگای هەیە بۆ چارەسەرکردن ئێمە چەند ڕێگاو چەند دەرمانێکیان باس دەکەین .

دومەڵ: بە شێوەی دەستە دەرمە و نیو ئەمکە چارەسەر دەکرێت وە پاککردنەوەی جەستەش لەو زیادە و چەوری و میکرۆباتانە وە بە هۆی خواردنی ترشەمەنی و تۆوی گەلێک میوەوە وەك (١٠٠غم تۆوی کاهو)+(١٠٠غم ترشە سماق)+(٥،١لیتر ئاو بیکوڵێنی بۆ ماوەی ١٥ دەقیقە دوایی بیپاڵێوی و ئەخۆش ژەم ژەم و جاری (١)پیاڵە پێش نان بخوات).

زیبکە : ٥٠ سم٣ ئاوی لیمۆی ترش+٥٠سم٣ ئاوی سرکە+١٠ غم هەنگوین شەوانە دەمو چاوی پێ چەور بکات (٥)شەو لەسەر یەك تا بەیانی پێوەی بێت بە یانی بشۆرێ پارێز بکات لە خواردنی چەورو شیرین و نیشاستە و خواردنی سوك و ئاوی میوە بخوات.

## ئەخۆشی گورچیلە و میزەڵدان

خوێنەری بەڕێز هەر دەرمانێك لەمانە چارەسەرێکە واتە تۆ هەریەك دەرمانیان بەکار دێنی...

١)-:(ڕیشی گەنمەشامی + پەیکوڵ +گەڵای گوێز + قەیتەران + گوڵە گوزروان)یەکی ١٥٠غم+یەك لیتر ئاو بکوڵێت دوای پاڵاوتن بخورێتەوە رۆژی سێ جار پێش نان چارەسەری بەردی گورچیلە و میزەڵدان دەکات).

٢)-:(ڕیشی گەنمەشامی + گیای گەزنە یەکی ٢٥٠ غم تێکەڵ بکە ،پاشان جاری ٥٠غم+نیو لیتر ئاو بکوڵێت رۆژی سێ جار پێش نان بخورێتەوە چارەسەری سوزەنەك و میزە چرکە دەکات) .

٣)-:(گژە دار یان (دارو زەم) پێستی ئەم درەختە بە کوترلوی جاری دوو کەوچك هەوکردنی میزەڵدان چارە دەکات .

قازی ئاڵما + گەزنە لەهەریەک یەک پیاڵە + دوو پەرداخ ئاو وەک چا بکوڵێت بپاڵێوری بخورێتەوە میز بەردەدات.

٤)-میوەی سنجو (یان ترەختی سرنچکە)+ عناب + وەنەوشە + گەزنە لە هەریەک ١٠٠ غم (یان هەریەکێک یەک پیاڵە)+ ١،٥ لیتر ئاو بکوڵێت وەک چا بخورێتەوە ڕۆژی سێ جار چارەسەری إلتهاباتی گورچیلە و میزەڵدان دەکات.

٥)-ترکە کەرکوڵ (یان ترکە خەی) هاراوەی ڕەگی ئەم گیایە جاری یەک کەوچک چا + یەک پیاڵە ئاوی گەرم ئەمجا بدرێ بە منداڵ چارەسەری میز بە خۆدا کردن دەکات .

٦)-دارچینی + زەنجەفیل + گوڵەوان یەکی ١٠٠ غم ئەمجا جاری یەک کەوچک چێشت لەوتێکەڵە + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێتەوە ماوەی ١٠ ڕۆژ چارەسەری ڕملی گورچیلە دەکات .

٧)-بە هۆی سەرما یان میکروب و إلتهاب یان خواردنی خراپ و کاریگەری تیژ گەڵ هۆی تر توش دەبێ ٥٠غم گەڵا گوێز+٥٠سم$^{3}$ ئاوی لیمۆ یان وشک کراو ١٠ دانە+٥٠ غم ڕەگی هەرێز+٢ لیتر ئاو بیکوڵێنی و بیپاڵێوی ٣ ژەم لێی بخوات جاری ١ پەرداخ ١٠ ڕۆژ بەردەوام بێت.

## پرۆستات

نەخۆشیەکی تایبەتی‌یە بە زۆری لە تەمەنی (٥٠)ساڵیدا ڕو ئەدات توشی پیر ئەبێت پرۆستاد بە هۆی بێ هێزی گلاندی پرۆستات و إلتهاب و میکروب و بێ هێزی لەشی مرۆڤەکەوە دروست ئەبێ ئەمجا لە شێوەی زیبکەیەکی بچوک لەناو میزەڵداندا پەیدا دەبێت و وردە وردە گەورە دەبێ و دەبێ بە دومەڵ تەشەنە دەکات لەوانەیە پاش ماوەیەک ڕێگەی میز کردن بگرێت وە نەخۆشی میزە چرکەی ئەبێ وە دوای خوێن ڕێژی هەبێ ئەم خوێن ڕێژی‌یە مەترسی نیە بگرە سودی هەیە هەرچەند نەخۆشکە ئەترسێ .

چارەسەر کردن : (١ شوتی بە توێکڵەوە)+(٥٠سم$^{3}$ ئاوی لیمۆ)+(٥٠ غم گەڵا گوێز)+(٥٠ غم پەیکوڵ)(٥٠غم هەرێز)بکوڵێت لەگەڵ ٢ لیتر ئاو بکوڵێت ٣ ژەم جاری ٢ پەرداخ بخوات ١٠ ڕۆژ بەردەوام بێ.

## گرانەتا

کاتێك بە هۆی خواردنی ئاوی پیسەوە میکرۆبی گرانەتا ئەچێتە ناو لەشی مرۆڤەوە توشی دەکات،چارەسەر کردن ئاسانە کاتێك دەرکەوت کە گرانەتایەتی نەخۆش تامی دەمی ناخۆش دەبێ تای لێ دێ کە مێکیش لەرزو سەر ئێشە و ئازارێکی توندی هەیە دەماری پشت سەرو ملی زۆر دەیئێشێت ناو بە ناو ئارەق دەکات و پەڵەی سپی لە سەرزمانی دەردەکەوێت . تێبینی : هەرکام لەم دەرمانانە بەکار بهێنی جیاوازی نیە..

چارەسەر کردن :

١)- ٥٠ غم سیر + ٥٠ غم ڕەشکە + ١٠ غم بیبەر + ٢ لیتر ئاو بکوڵێت و بپاڵێورێ بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ ڕۆژی ٣ ژەمی ١ پیاڵە پێش نان خواردن/دوای نان خواردن ژەمی ١ پەرداخ لیمۆی ترش .

٢)- عەرەقی نەعنا ٥٠ غم + ٥٠ غم جاترە + ٥٠ غم گوڵی پونگە +٥ لیتر ئاو بکوڵێت بپاڵێورێ و ٣ ژەم ژەمی ١ پیاڵە ٥ ڕۆژلەسەر یەك پێش نان خواردن .

٣)- ٥٠ غم گەڵا بی + ٥٠ غم ڕازیانە پاش کوڵاندن ٣ ژەم ژەمی پیاڵەیەك ٧ ڕۆژ بەکار بێ .

## گرژبونی دەمارەکان (تصلب الشراين)

بە هۆی چەوریەوە کە دەبێ بە هۆی کولیسترۆڵی خوێن کە لە ناو دەمارەکان و مولولەکانی خوێن لە مێشك دا کە وردە وردە دەتەنێتەوە هەتا دەمارەکانی هەست و اعصاب دەگرێتەوە کە ئەمەش دەبێتە هۆی تەسك بونەوەی دەمارەکان لە وانەیە ڕۆژێك بێت کە لە کار بکەوێت ئەگەر لە تەمەنی (٢٨-٣٥ ساڵی)دا ڕویدات ئەوا ئەو کەسە هەستی لاواز دەبێت بە تایبەتی بیرە وەری‌یانی(حافظەی)کەم ئەبێتەوە وە ئەگەر دەمارەکان نزیکی تەواو گیران ببێت ئەوەنەخۆش کوێر دەبێ وە ئەگەر بە تەواوی بیگرێ ئەوا توشی شەلەل دەبێ یان توشی جلدەی مێشك یان دڵ دەبێ ئەوا ژیان لە دەست دەدات.

چارەسەر کردن؛

ئەگەر بۆ ماوەی ٣ هەفتە ئەم دەرمانانە بەکا بهێنرێت ئەوا سودی لێ وەردەگرێ :

ترشە سماق + تۆوی کاهو +تۆوە سورە +ئاوی سیر + ١ لیتر ئاو پاش کوڵاندن بەکار بێت و بخورێتەوە ئەوا چارەسەری ئەکات و ناو دەمارەکان پاك ئاکاتەوە لە چەوری وە

شەتەل چارەسەر دەکات ، دەبێ پارێز بکات لە چەوری و سوێری وە سود وەربگرێ لە میوە و ئاوی میوە .

## سیل (T.B)

نیشانەکانی نەرمە کۆکە/تا لێهاتن/تەنگە نەفەسی و لاواز بوون ، ئەم نەخۆشی‌یە توشی سی‌یەکانی مرۆڤ دەبێت بەهۆی بەکتریایەکی چیلکەیی یەوە/وە ئەگەر چارەسەر نەکرێت ئەوا دەتەنێتەوە هەمو لەش دەگرێتەوە تەنانەت ئێسقان و مۆخیش.

چارەسەر کردن :

٢٥٠ غم گوڵە باغی بۆن خۆش +٧٥٠غم شەکر + ٥ کەوچك ڕۆن زەیتون + ١ لیتر ئاو بیکوڵێنە هەتا خەست دەبێتەوە پاشان ٣ژەم پێشخواردن ژەمی ٢ کەوچکی چێشت بخورێت دوای خواردنیش ١ سەلك سیر + ٢ کەوچك ڕەشکە + ١ پەرداخ ئاوی لیمۆی ترش ، پارێز لە سەرما بکات .

## برینی دوانزە گرێ و گەدە(قرحة المعدة و إثني عشري)

هۆی دروست بوونی نەخۆشی برینی دوانزە گرێ و گەدە ئەمانەن/خەفەت و تورەیی و جگەرە کێشان و مشروب خواردنەوە و هیلاك بون و کەم خەوی و کەم إستراحەتی و خواردنی پیس و بەکتریای نەخۆشی‌یەکە/نیشانەکانی/غازاتی گە دە و ورگ با کردن و سوتاندنەوەی گەدەو ئازاری دەورو بەری پێش ئاوك وە هەرس نەکردنی و کەم ئیشتهاو گەلێ جار ڕشاندنەوەیش لەگەل دل تێك هەڵاتن.

چارەسەر کردن :

١)-ماوەی یەك مانگ ئاوی ترێ بخواتەوە جاری ١ پەرداخ لە ڕۆژێ .

٢)-بنێشتە تاڵە + قەزوان + هاراوەی شەکر بکرێ بە(حَب)ژەمی بە قەدەر هەلماتێکی لێ بخوات بە یانی و ئێوارە پێش نان خواردن/دوای نان خواردن عەرەقی نەعنا ٣ ژەمی پیاڵەیەك/پارێز بکات لە شتی سورەوەکراو کەم خۆری دایم خۆر بێ .

## ئیلتهابی جگەرو کیسەی(صفرا)زەردویی

بە هۆی ئیلتهابی جگەر یان دومەڵەوە یان بە هۆی میکرۆبەوە جگەر هەو دەکات یان بە هۆی بەردی صەفراوە یان بە هۆی گیرانی جۆگەی صەفرا زەردویی روو دەدات پێویستە .

١)-دەرمان بەکار بهێنین .٢)- پارێز بکات لە چەوری و گۆشت و هێلکە .٣)- خواردنی ماسی و شیرینی زۆر پێویستە هەر وەها إسراحەت کردن .

چارەسەر :

١)-کاکڵ زەرد نیو پیاڵە لە کوتراوی ئەم گیا + ١ پەرداخ ئاو بکوڵێت پاش پاڵاوتن بخورێت .

٢)-رەشکە ١٠٠غم + ١ کغم هەنگوین ٣ ژەم پێش نان ٢ کەوچک چێشت . ٣/دارچینی ٣ ژەم ژەمی ١ کەوچك چا + ١ پیاڵە ئاوی کوڵاو ماوەی ١ مانگ .

٤)- جۆ + رەگی هێرۆ + گوڵە وەنەوشەیەکی ١٠٠غم + ٣ لیتر ئاو پاش کوڵاندن ژەمی ١ پەرداخ بخوات .

## ئازارو هەوکردنی جمگەکان و ئەژنۆ

بەهۆی بونی رتویەت و إلتهاباتی روماتیزم لە ناو جومگەکاندا پو دەدات و دە ئاوسێ و هەو دەکات جاری واش هەیە کە توزەکەی ئاو دروست دەبێ لە نزیک ئەژنۆکانی قاچەوە چارەسەر کردنی بە دەرمان و نوێ نمەك دەکرێ

چارەسەر کردن :

٥٠ غم هەزبێ + ٥٠ غم مێخەك + ٥٠ غم تونکلی هەنار + ٥٠ غم گوڵە بەیبون + ٥٠ غم سوسی ئارد + ٥٠غم سیر وەك نیو نمەك دەدرێ لە شوێنی ئاوساویەکە بە نایلۆن بی بەستێ ٢ شەو لێی بنێ چاکی دەکات .

## پەڵەی سپی سەرچاو ;تانە;

ئەمە بەهۆی دروست بونی نەخۆشیەکانی چاوەوە دروست دەبێ گەڵێ جار إنسان لە .تەمەندا لێی رودەدات .

چارەسەر کردن:

بیبەری هاڕلو بە لاسکەوە و تۆوەوە + نوشاتر پاش بێژانەوە + قەڵەمە بە ئەندازەی یەك، لەمجا چاوی پێ بڕێژێ ۳ میل چۆك بهێنێ بە چاویا پاش سەعاتێك بە ئاوی سارد چاوی بشوات دوبارە بکەیتەوە تا چاك بون .

## مایەسیری

بریتی‌یە لەو إلتهاباتەی کە لە کۆتایی دەرگای کۆڵۆن و ناوەوە و دروست دەبێ و زیاد دەکات و دەبێ بە هۆی ئازارو لاواز بونی مرۆڤ ئەویش ۲ جۆرە جۆرێکیان پێی دەوترێ تەڕەمایەسیری کە ئەمە سەری دوگمەکان ئەقلیشێنەوەو و خوێنی لێ دێت ئەوی تریان پێی ئەوترێ وشکە مایەسیری ئەمە ئێش و ئالۆشی زیاترە لە ناو کۆڵۆندایە پێویستە پارێز بکات لە سەرما و خواردنی چەوری و ترش .

چارەسەرکردنی مایەسیری ووشك :

۱)-توتن +تۆوی بی (تەڕبی)بیکەی بە شاف ٥ شەو بەکاری بێ .

۲)-گیای چنارە کەڵە + بەزی ئاژەڵ شاقی لێ دروست بکەو و شەوی شافێك هەڵبگرێ ٥ شەو لەسەر یەك.

چارەسەری تەڕە مایەسیری:

قازی ئاغا + گەزنەبەخوێ بکوترێ و بکرێ بە شاف‌٥ شەو شەوی شافێك هەڵبگرێ، نیشانەکانی ئەم نەخۆشی‌یە/بریتی‌یە لە قەبزی و غازات و ئێش و بێ هێزی کۆڵۆن وئازاری قوڵ و قاچ بە کۆڵنج و ئازاری باریکای پشت و شان و مل و سەرئێشە و بێ هێزی و دڵ تێك هەڵهاتن و گەڵێ جار کەم خۆراکی .

## پەستانی خوێن (ضغط الدم)

بەرزبونەوەی پەستانی خوێن بە هۆی تەنگ بونەوەی دەمارەکانی خوێن بە هۆی کۆلیسترۆڵەوە و هەروەها بە هۆی کارەسات و روداوی دڵ تەزێن و هۆی پیری و بێ هێزی مرۆڤ ، دەبێ مرۆڤ پارێز بکات پێش ئەوەی چارەسەر بە دەرمان کات نابێ خواردنی چەور و سوێر بخوات نابێ غەم و خەفەت بخوات

چارەسەر کردن:

١/ ئاوی ماست بیکاتە تورەکەوە ئاوەکەی ترشەکەی ئەوی ٢ پیاڵەی لێ بخوات بەیانیان پێش نان ٥٠/٢ غم گەڵا کەلەرم بە کوترلوی +٢ پیاڵە ئاوی لیمۆی ترش بە یانیان و ئێواران بخورێت بۆ ماوەی ١٥ رۆژ .

## نەخۆشی شەکرە

بەرزبونەوەی شەکر لە خوێندا بە هۆی لاوازی پەنکریاسەوەیە مادەی ئەنسولین لە خوێندا کەم ئەبێ و شەکر زۆرتر. نیشانەکانی گێژ بوون و سەر ئێشە و بێ هێزی و لە بیرچونەوەو میزە چرکە و میز زۆر کردن و دەم ووشك بون و ئاو زۆر خواردن و تورەیی و گیان لە رزاندنەوەی حەواس و بێ تاقەتی ، جۆرێکی تریشی هەیە کە نزم بونەوەی شەکرە .

چارەسە کردن :

بۆ شەکر بەرزی خواردنی رەشکە یان شەڵی یان گەلابی . بۆ نزمی شەکر ئەبێ شەکرو شیرین بخۆی .

## پیس بونی خوێن

ئەمە بەهۆی زۆربونی کۆلیسترۆل زیاتر لە ٢,٥ غم لیتر لە خوێندا یان صفرا یان میکروبات .

چارەسەر کردن :

خواردنی ئاوی لیمۆی ترش + ترشە سماق +شاتو سورە بۆ پاکردنەوەی خوێن لەو ژەمرانە.

## ئازاری دڵ (دڵ ئێشە)

نەخۆشییەکانی دڵ زۆرن هەر لە بێ هێزی دڵ و دەرکەوانە و دەمارەکان هەتا ماسولکەکانی دڵ دەبنە هۆی ئازاری دڵ هۆی ئەم نەخۆشیانەش زۆرە هەر لە نەخۆشیە بۆ ماوەکان هەتا هۆ دەروونییەکان و بێ خەوی و هیلاك بون و مشروب خواردن و جگەرە کێشان و دەرمانی کیمایی و سەرماو روماتیزم.

چارەسەر کردن: بۆ بەهێزی دڵ

١)-گوڵی گوێزروان + سنبل طیب یەکی ٢ مثقال پاش کوڵاندنی لەگەڵ نبات بیخوات ماوەی ٤٠ رۆژ.

٢)-ئاوی ئاڵتون بخواتەوە یانی پارچە ئاڵتونێك لە ئاو دا بسوتەوە ئەمجا بیخواتەوە.

٣)-عارەقی بی ٣ ژەمی ١ پیاڵە بۆ ئازاری دڵ/شنگ + زەردێنەی هێلکە بیکات بە شلتە و بیخوات

٢)- هەمویەیانییەك ١ پەرداخ ئاوی سارد بخواتەوە.

٣)-عارەقی رازیانە +وشکە+شملی رۆژی ٢ جار جاری ١ پیاڵە ل-رەشکە + هەنگوین ٢٥٠ غم بۆ ١ کفم بە یانیان و شەوان جاری ٢ کەوچك چێشت بخوات.

## هەندێك لەو دەرمانانەی کە بۆ گورچیلەو میزلدان شیفا بەخشە

تێبینی: هەموو جاری یەك دەرمانیان بەکار بهێنی ئەگەر چاك نەبوو ئەوا دەرمانێکی تر:

١)-٥٠٠غم گەڵا گوێز +٥٠٠غم گیای گەزنە +٥٠٠ غم رەگی هەرێز +١٠٠ لیمۆی وشك ترش پاش کوڵاندن و پاڵاوتن رۆژی ٣ جار جاری یەك پەرداخ بخواتەوە بۆ ماوەی ١٠ رۆژ.

٢)-٥ کفم شوتی بە توێکڵەوە + ٥٠ غم گەڵا گوێز+ ٥٠ غم رەگی هەرێز +٢-٣ پەرداخ ئاوی لیمۆی ترش پاش کوڵان وە پاڵاوتن ٣ ژەم ژەمی ٢ پەرداخ بخواتەوە.

٣)-١٠٠غم گەڵا گوێز +١٠٠غم رەگی هەرێز +٥٠ غم قەیتەران +١٠٠غم پەیکوڵ +٥٠غم گەڵا گەزنە +٣ لیتر ئاو پاش کوڵاندن و پاڵاوتن ٣ ژەم ژەمی ١ پەرداخ بخورێت پێش نان.

**ئەگەر گورچیلە بەردی هەبو ئەم دەرمانانە بەکار بهێنە :**

١)- ١هێلکە پاك بشۆرەوە بە تونکڵەوە +ئاوی لیمۆی ترش ٦-٧پەرداخ بیخەرە ناو ئاوی لیمۆکە بیخە ناو شوشەیەك و سەری بنرێتەوە کە هەوا نەدات هەتا ٣ رۆژ دای بنێ دەبینی هێلکە کە تواوەتەوە لە ناو ئاوە ترشەکەدا ٣ ژەم ژەمی نیو پیاڵە پێش نان بۆ گەورە، ١ کەوچك چێشت بۆ بچوك .

٢)-٥٠ غم جۆ ورچ +٥٠ غم گەڵا گوێژ +٥٠ غم پەیکوڵ +٥٠ غم گەڵا گەزنە +٢ لیتر ئاو پاش کوڵاندن و پاڵاوتن ٣ ژەم ژەمی ١ پەرداخ پێش نان .

٣)-١٠٠ غم جۆ +١٠٠غم گوڵی وەنەوشە +١٠٠ غم رەگی هێرۆ و پاش کوڵاندن وپاڵاوتن ٣ ژەم ژەمی ١ پەرداخ پێش نان بخوات.

٤)-١٠٠غم کاشمە +١٠٠غم زنیان+١٠غم رازیانە+١٠٠غم گوڵە پەنجە +٥٠غم رەشکە +٥٠غم شملی +٢لیتر ئاو پاش کوڵاندن و پاڵاوتن رۆژی ٣ جار جاری پیاڵەیەك بۆ ماوەی ٢٠ رۆژ بەرد لا دەبات و بۆ میزە چرکە و میز گیران باشە.

٥)-١٠٠غم کەما +١لیتر ئاو ٣ ژەم و ژەمی ١ پەرداخ پێش نان خواردن .

٦)-١٠٠غم بناوە تۆم + ١لیتر ئاو و پاش کوڵاندن و پاڵاوتن ٣ ژەم و ژەمی ١ پەرداخ دوای نان خواردن .

٧)-٥٠غم گوڵەمەنگ +٥٠غم بەیبون +٥٠غم پەیکوڵ +٥٠غم گەزنە+١ لیتر ئاو پاش کوڵاندن ٣ ژەم ،ژەمی ١پەرداخ پێش نان بخوات .

٨)- ٥٠ غم کەرەوزی کێوی (جافری کێوی)+٥٠غم گەڵای گوێژ +٥٠غم گەڵا هەرمێ +٠.٥لیتر ئاو پاش کوڵاندن بەرۆژێك بخورێتەوە بۆ ماوەی ٧ رۆژ.

٩)- ٥٠غم کەرەوزی کێوی + ٥٠غم سیر + ١ لیتر ئاو ٣ژەم ژەمی ١ پەرداخ پێش نان خواردن دوای کوڵاندن و پاڵاوتن بخورێتەوە.

١٠)- قەیتەران +کەرەوز +پەیکوڵ +گەڵا گوێژ +گوڵە گێزەوان یەکی ٥٠ غم +٢لیتر ئاو پاش کوڵاندن بە ١ رۆژ ٣ ژەم هەمو بخورێنەوە بۆ ١٥ رۆژ .

١١)- بەیبون +گوزەڵان +گوڵە باغ +تۆوی گژنیژ هەریەکی ٥٠ غم تێکەڵاو بکە و٣ ژەم ژەمی ١ کەوچك چێشت بۆ ١ پەرداخ ئاو پاش کوڵاندن ٧ رۆژ بخورێتەوە .

١٢)- ١٠٠غم قناولی +١٠٠غم قەیتەران +٥٠غم رەشکە دوای تێکەڵاو کردن ١ کەوچك چێشت بۆ ١ پەرداخ ئاو دوای کوڵاندنی بیخواتەوە ٧ رۆژ بە بەردوامی .

١٣)- شێلم +مەرزەنگۆش +قەیتران یەکی ٥٠غم +١ لیتر ئاو دوای کوڵاندن بە ١ رۆژ بخورێتەوە.

١٤)-کولەکە زەردە پاش کوڵاندن ٣ جار جاری ١ پەرداخ لەو ئاوە پاڵاوتەیە پێش نان خواردن بخوات .

١٥)-قنگر فرنگی(قنگرە کەرانە)+ گەزنە + گوڵە پەنجە +لەیتەران ٢٠٠غم + ١ لیتر ئاو ٣ ژەم ، ژەمی ١ پەرداخ پێش نان ١٠ رۆژ .

١٦)-زیرە +رازیانە +رەشکە +تۆو شویت هەریەکی ١٠٠غم تێکەڵاو بکە ١ کەوچک چێشت بۆ ١ پەرداخ ئاو دوای کوڵاندن وەک چا بیخواتەوە ٧ رۆژ .

١٧)-ریشەن (گیا لەبان)+گوڵە هێرۆ +پەیکوڵ هەریەکی ١٠٠غم تێکەڵاو بکە ١ کەوچک چێشت بۆ ١ پەرداخ ئاو کوڵاو بە ٣ ژەم و بیخوات ١٥رۆژ بەردەوامبێ.

١٨)-١٠٠غم گەڵاگوێز +٥٠٠غم قەیتەران +٥٠٠غم بەیبون+١لیتر ئاو بە رۆژێک بخورێتەوە ١٥ رۆژ بەردەوام .

١٩)-لیمۆی ترش +ئاوی شوتی ٣ ژەم ١ پەرداخ ماوەی ١٥ رۆژ

٢٠)-گێزەر +رازیانە +سەلمکە یەکی ٥٠غم + ١ لیتر ئاو ٣ ژەم ژەمی ١ پەرداخ ١٠ رۆژ بەردەوام.

٢١)-گیا ژانە (گیا ئازار)رۆژی ٣ کەوچک لەم گیا بۆ ٣ پەرداخ ئاو دوای کوڵاندن وپاڵاوتن بیخوات بۆ ماوەی ٧ رۆژ.

٢٢)-١٠٠غم هەنجیر دوای کوڵاندن +٢پەرداخ شیر بەیانیان پێش نان بخورێت بەردەوام ٥ رۆژ قنچکی پێوە بێ باشترە .

٢٣)-شاتەرە +چڵچەقە +گەڵا گوێز یەکی ١٠٠غم +١ لیتر ئاو ٣ ژەم ژەمی ١ پەرداخ ماوەی ١٠ رۆژ بەردەوام .

٢٤)-گیای شەماڵ گیر + تۆوی شویت تێکەڵی بکە ١ کەوچک چێشت بۆ ١ پەرداخ ئاو دوای کوڵاندن ٣ ژەم بخورێت بۆ ١٠ رۆژ .

٢٥)-گوڵ و گوڵای بامیە +نەعنا +گوڵە گوێزروان یەکی ٥٠ غم +١ لیتر ئاو بە ٣ جار لە رۆژێکدا بخورێتەوە ١٠ رۆژ بەردەوام .

٢٦)-سوسی جۆ +سوسی گەنم+لیمۆی وشک هەریەک ١ کغم + لیتر ئاو ٣ ژەم ژەمی ١ پەرداخ دوای کوڵاندن ١٠ رۆژ بەردەوام .

٢٧)-تۆو کاهو ١٠٠غم +وەنەوشە ١٠٠غم +کەرەوز ١٠٠غم +گەزنە ٥٠غم + بەیبون ٥٠غم + گوێزروان ٥٠غم +نەعنا ٥٠غم + ڕەگی هەرێز ٥٠غم + ٢ لیتر ئاو پاش کوڵان بە٣ جار لە ڕۆژێکدا بخورێتەوە ٧ ڕۆژ .

٢٨)-تۆو کاهو ١٠٠غم +گوڵی وەنەوشە ١٠٠غم + کەرەوز ١٠٠غم + ١ لیتر ئاو دوای کوڵاندن ژەمی ١ پەرداخ بۆ ماوەی ١٠ڕۆژ بەردەوام .

٢٩)-بەیبون+گەزنە +ڕازیانە ٥٠غم لە هەریەکی + ١ لیتر ئاو دوای کوڵاندن ژەمی ١ پەرداخ بۆماوەی ١٠ ڕۆژ.

٣٠)-سێ پەڕە+وەنوشە+بەیبون+١لیتر ئاو یەکی ١٠٠ غم پاش کوڵاندن ڕۆژی ٢ ژەم جاری ١ پەرداخ .

٣١)-پسل ١٠٠غم +١لیتر ئاو پاش کوڵاندن ٣ ژەم بخورێت لە ١ ڕۆژدا ٧ ڕۆژ بەردەوام .

٣٢)-گەڵا گوێژ +گوێزروان +ڕیشی گەنمەشامی +قەیتەران +ڕەگی هەرێز +گەزنە یەکی ٥٠ غم+٢,٥ لیتر ئاو پاش کوڵاندن ژەمی ٢ پەرداخ ٥ ڕۆژ بەردەوام .

٣٣)-گوڵە سارێژ (گوڵە موسی)+ گەڵا بی +قەیتەران +شملی یەکی ١٥٠غم ئەمجا ١ کەوچك بۆ پەرداخێك ئاو پاش کوڵاندن ٢ ژەم بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ .

٣٤)-گوڵە خەڵات + هەزبێ یەکی ١٠٠غم تێکەڵ بکە ٢ کەوچك بۆ ١ پەرداخ ئاو ٢ ژەم بخورێت وەك چا .

٣٥)-نەعنا +پونگە +هەزبی +بەیبون +ڕازیانە +گژنیژ یەکی ١٠٠غم تێکەڵاو بکە پاشان ١ کەوچك بۆ ١ پەرداخ ٧ ڕۆژ بەردەوام بخورێت .

٣٦)-١٠٠غم ڕەشکە +١٠٠٠غم شملی +٢لیتر بۆ ڕۆژی پێنج جار بخورێتەوە ماوەی ٧ ڕۆژ .

٣٧)-ڕێحانە ڕەشە ١ کەوچك +١ پەرداخ ئاو بە کوڵاوی بیپاڵێوە ٣ ژەم ماوەی ٧ ڕۆژە بۆ میزەڵدان

٣٨)-تەماتە جنانی +هەزبی +ڕازیانە +قەیتەران یەکی ٢٠ غم بە تێکەڵاوی +٢ پەرداخ ئاو بکوڵێت بە ٢ ژەم بخورێت بۆ ٧ ڕۆژ لەسەریەك بۆ إلتهاباتی میزەڵدان .

٣٩)-گێلاس +قەیتەران +ڕازیانە +ڕەشکە یەکی ٥٠غم +١,٥ لیتر ئاو کە کوڵا ئاوەکەی بە دوو جار لە ڕۆژێکدا بخورێت بۆ ماوەی ٧ ڕۆژ بۆ بەردی گورچیلەو إلتهاباتی میزەڵدان .

٤٠)-قەیتەران +ڕازیانە +ڕەشکەیەکی ١٠٠غم بە تێکەڵاوی ١ کەوچك بۆ ١ پەرداخ دوای کوڵاندن ٣ ژەم بۆ ٧ ڕۆژ بۆ بەردی گورچیلە و میزەڵدان .

٤١)-گیا ڕکیشە + گەزنە یەکی ١٠٠غم تێکەڵاو بکە ٢ کەوچك بۆ ١ پەرداخ ئاو بە کوڵاوی ٣ ژەم بۆ ماوەی ٧ ڕۆژ بۆ بەردگورچیلە و ئلتهاباتی میزەڵدان .

٤٢)-پەڵپینە +پەیکوڵ +زنیان یەکی١٠٠غم ئەمجا ١ کەوچك بۆ یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت بخورێت. ٣ ژەم ماوەی ٥ ڕۆژ .

٤٣)-ئاوی تور ڕۆژی یەك پەرداخ ماوەی ٤ ڕۆژ بیخوات.

٤٤)- ڕێواس + شنگ +بەیبون + قەیتەران یەکی ١٠٠غم + ٢ لیتر ئاو بکوڵێت بە ٧ ڕۆژ هەمووی بخورێتەوە .

٤٥)-گوڵی یاسکەوە +هێرۆ +وەنەوشە یەکی ٥٠ غم ئەمجا ١ کەوچك + ١ پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت بە ژەمێك ٣ ژەم ماوەی ٧ ڕۆژ .

٤٦)-ڕەشکە + شمڵی + گژنیژ یەکی ١٠٠ غم تێکەڵ بکە ئەمجا ٥٠ غم + ٠,٥ لیتر ئاو بکوڵێت و بخورێت ماوەی ١٥ ڕۆژ بەردەوام.

٤٧)-شنگ +ڕازیانە + ڕەشکە + پەیکوڵ یەکی ١٠٠ غم تێکەڵ بکە ئەمجا ٥٠ غم + ١ لیتر ئاو بکوڵێت بە ٢ جار بخورێت بە ناشتا ماوەی ٧ڕۆژ .

٤٨)-ساڵمە جاری ١ کەوچك + ١ پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت ڕۆژی ٢ جار پێش نان .

٤٩)-گەنمە شامی +قەیتەران +گوزروان +هەزبی یەکی ٥٠ غم هەمووی + ٤ پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت ماوەی ٥ ڕۆژ.

٥٠)-بەڵاڵوك +بەیبون +هەزبی یەکی ١٠٠غم تێکەڵ بکە ئەمجا ٢ کەوچك + ٢ پەرداخ ئاو دوای کوڵان ٧ ڕۆژ بۆ هەو کردنی گورچیلە .

٥١)خواردنی ڕازیانە و ئاوی لیمۆی ترش و نارنج و پرتەقاڵ و هەناری ترش چارەی هەو-کردنی میزەڵدان دەکات .

٥٢)-گەزنە +بەیبون+قەیتەران +ڕەشکە + گوزروان + قازی ئاغا + پونگە هەر یەکەی ٢٠٠ غم بەتێکەڵاوی ڕۆژی ٣ جار جاری ١ پیاڵە + ٢ پەرداخ ئاو وەك چا بکوڵێت بخورێت بە بانیان و ئێواران پێش نان خواردن بۆ ئلتهابی میزەڵدان و سفلس و ئلتهاباتی گورچیلە زۆر باشە .

## ئەو دەرمانانەی بۆ نەخۆشی یەکانی گەدەو ڕیخۆڵە شیفا بەخشن

تێبینی: جاری یەک دەرمان بەکار دێنێت ئەگەر چارەسەری نەکرد ئەوا بیگۆڕێت بە دەرمانێکی تر:

١)-مازو + ترشە سماق + گوڵی پونگە یان نەعنا هەریەک ٣٠٠ غم بکوترێ جاری دوو کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت دوای پاڵاوتن ئاوەکەی بخورێتەوە چارەسەری برینی گەدەو ڕیخۆڵە دەکات .

٢)-گوڵە هەنگوین جاری یەک کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت(معدە)بەهێز دەکا کرمی(معدە)و ڕیخۆڵە دەکوژێ/هەنجیر ئێواری بکرێتە ئاو بەیانیان بخورێت إشتهای مرۆڤ زیاد دەکات .

٣)-گوڵی جان + دارچینی + زەنجەفیل یەکی ١٠٠ غم جاری یەک کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت وەک چا بخورێتەوە ڕۆژی سێ جار بە ناشتا بۆ نەخۆشی گەدە کە چەوری دەوری ئەگرێ چاکی دەکات .

٤)-بۆ ئاوی دەوری ناوک دەبێ بچێتە گەرماو تا عەرەق دەکا لەسەر لای ڕاست و چەپ پاڵ بکەوێ ئەوا چاک دەبێ دوای عارەق کردن خۆشتن بچێتە ناو جێگەیەک بخەوێت .

٥)-(زەردە زیرەیەک) بە زێندووی بیگرێ و بینێت بە سکی‌یەوە نزیک ناوکی ئەوا چارەسەری ئازاری دەوری ناوک دەکات کاتێک پێوەی دا بەو ژەهرو شیفای دێت .

٦)-بۆ سکچوون مازو + ترش + گوڵی پونگە دوو کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێ و بخورێ بۆ چەند جارێک چارەی سکچوونی خوێناوی برینی گەدە دەکات .

٧)-سیر + ماست بۆ سکچوون زۆر باشە .

٨)-مازو + پێستی ناسکی بەڕو + ترشە سماق یەک پیاڵە + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێ بە دوو جار بخورێ بۆ سکچوون.

٩)- ئاردە برنج + دۆ ڕۆژی سێ جار بخورێ بۆ سکچوون .

١٠)-پونگە + رازیانە جاری دوو کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێ و بخورێ بۆ سکچوون .

١١)-ئاوی ترێ ٣ ژەم ژەمی ١ پەرداخ بۆ ماوەی ١ مانگ بەردەوام.

١٢)--٥٠ غم بنێشتە تاڵ + ٥٠ غم قەزوان + ٥٠ غم شەکر وەک حەبی لێ بکرێت بە یانی و ئێواران پێش نان بۆ ماوەی ١٥ ڕۆژ بخورێت.

۱۳)-عەرەقی نەعنا یان عەرەقی پونگە ڕۆژی ۳ جار جاری ۱ پیاڵە .

۱٤)-عەرەقی نەعنا + عەرەقی ڕازیانە +عەرەقیبەیبون ۳ ژەم ژەمی نیو پیاڵە بۆماوەی ۱۰ ڕۆژ ، بۆ برین ی(معدة)زۆر باشە .

۱٥)-۵۰ غم گەون یان گەتیرە +۲۰۰ غم زەمغی عەرەبی +۵۰۰ غم زیرە +۵۰ غم ڕەشکە +۱ کغم هەنگوین بە یانی و نێوارێ جاری ۱ کەوچک پێش نان بۆ مارەی ۵ ۱ڕۆژ بخورێت .

۱٦)-بەڕو بە کوتراوی پێش نان بخورێت .

۱۷)-عەرەقی چەق چەقە + عەرەقی شاتەرە + نەعنا ۳ ژەم جاری یەک پیاڵە + عارەقی گەلا بی بۆ ماوەی ۱۰ڕۆژ.

۱۸)- ۱کغم هەنگوین +۲۵۰غم ڕەشکە بە یانیان و نێوراران یان شەوان جاری دوو کەوچکی چێشت تا تەواو دەبێت .

۱۹)-۱۰غم گوڵە ئاسۆ (گوڵە ئەستێرە)+۱۰ غم گوڵە مێو + پەرداخێك ئاو دوای کوڵاندن وەك چا بخورێتەوە بۆ ماوەی ۱۰ ڕۆژ .

۲۰)-ڕەگی گەون یان کەتیرە +زەمغی عەرەبی +هەنگوین یەکی ۵۰ غم بۆ دوو ژەم بەیانی و نێوارێ پێش نان بۆ ماوەی ۱٥ ڕۆژ .

۲۱)-۱۰غم توێکڵە مارانە +۱لیتر ئاو دوای کوڵاندن سێ ژەم ژەمی یەك پیاڵە بۆ ماوەی ۱٥ ڕۆژ .

۲۲)- هاز دوای کوڵاندن ژەمی یەك پەرداخ + یەك پیاڵە سرکە بۆ ماوەی ۷ ڕۆژ بەیانیان و نێوراران .

۲۳)-کەما یەك کەوچك +یەك پەرداخ ئاو دوای کوڵاندن بەیەك ڕۆژ بخورێت سێ ژەم ماوەی ۷ ڕۆژ .

۲٤)-۱۰غم حێل +۱۰ غم زەنجەفیل + یەك پرداخ ئاو دوای کوڵاندن بەیەك ژەم بیخوات بە یانیان ونێوراران ۷ ڕۆژ بەردەوام .

۲٥)-۵۰غم بادەم +۵۰غم قەیسی بۆ یەك ژەم بەیانیان و نێوراران بۆ ماوەی ۷ ڕۆژ .

۲٦)-۲۰۰غم تۆو تاوگ +۲۰۰غم کاکڵە گوێز +۲۰۰غم هەنگوین دوای کوڵان بەیانیان و نێوراران جاری دوو کەوچك بخوات بۆماوەی ۷ ڕۆژ .

۲۷)- ۱۰۰غم بەرزە لنگ +۱۰۰ غم ڕازیانە ، سێ ژەم بخورێت جاری دوو کەوچك چێشت .

۲۸)-۲ کەوچك تەرخەونی وشك + یەك پەرداخ ئاو دوای کوڵاندن وەك چا بخورێتەوە بەیانیان و نێوراران .

٢٩)-١٠٠غم تۆوی شویت + ١٠٠غ زیرە جاری دوو کەوچك چێشت بۆ یەك لیتر ئاو دوای کوڵاندن وەك چا بخورێت بۆ غازات .

٣٠)-بەیبون +گوڵە گوڵزەوان +گژنیژ +گوڵە باغ یەکی ٥٠غم دوای ١ کەوچك بۆ یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت وەك چا بخورێت بۆ هەمو إلتهاباتێك .

٣١)-شەروال بە کوڵ یان (شەلەمە کێویلە)ژەمی ١٠-٢٠غم بخورێت بۆ إلتهابات و قەبزی.

٣٢)-١٠٠غم رازیانە +١٠٠غم زیرە +١٠٠غم تۆوشویت تێکەڵی بکە سێ ژەم ژەمی یەك کەوچك بۆ یەك پەرداخ دوای نیو سەعات کوڵاندن بخورێت بۆ ژان و با.

٣٣)-قاقلی دێمی جاری یەك کەوچك بۆ یەك پەرداخ سێ ژەم وەك چا دوای کوڵاندن بخورێتەوە پێش نان خواردن.

٣٤)-علی بابا +هەنگوین ژەمی دوو کەوچك پێش نان خواردن .

٣٥)-سمل جاری ١٠غم دوو ژەم پێش نان بخورێ .

٣٦)-مێخەك +گوڵە گوڵزەوان یەکی ٢٠ غم بۆ پەرداخێك ئاو دوو ژەم بخورێت .

٣٧)-تۆوی گیا چاوانە جاری دو کەوچك چێشت بۆ یەك پەرداخ ئاو پاش کوڵاندن سێ ژەم بۆماوەی ٥ رۆژ بۆ ئازار و غازات و مێزڵدان.

٣٨)-نارگیل سێ ژەم ژەمی دو کەوچك بۆ یەك پەرداخ ئاو پێش نان خواردن بۆ پاك کردنەوەی ریخۆڵە و لا بردنی ژان و باو گرفت (قبض) .

٣٩)-ناوکی کاڵەك +ناوکی خەیار +ناوکی شوتی یەکی ٥٠ غم + دو پەرداخ ئاو پاش کوڵاندن بۆ پاك کردنەوەو و إلیتهابیقۆلۆن و ژان و با.

٤٠)-کولەکە،خواردنی پاڵاوتەی ئاوەکەی بە یانیان بە ناشتا بۆ ماوەی ٧ رۆژ بخورێت ریخۆڵە پاك دەکاتەوە لەگەڵ خوێن.

٤١)-گژنیژ بە یانیان و ئێواران جاری یەك کەوچك بۆیەك پەرداخ ئاو دوای کوڵاندن بخورێت بە ناشتا.

٤٢)-سەڵەمکە رۆژی ١٠٠غم پاش کوڵاندن سێ ژەم بە ناشتا بخورێت غازات،ژان و با لەبات.

٤٣)-توە فەرەنگی سێ ژەم ژەمی یەك پیاڵە،شەربەتی تۆوە فەرەنگی پێش نان خواردن بخورێتەوە.

٤٤)-حوشتر خۆرە (خورئیك)+ چەقچەقە رەگەکەی یەکی یەك کەوچك + دو پەرداخی ئاو دوای کوڵاندن بە ناشتا بخورێت بە یانیوئێوارە

٤٥)-بەڵەك ژەمی ۲۰غم رەگی بەڵەك بۆ یەك پەرداخ ئاو سێ ژەم بخورێت بۆ ماوە ۱۵ رۆژ بۆ إلتهاب یان برینی گەدە و ریخۆڵە .

٤٦)-پەمو گەڵا و گوڵەکەی + ئاوکی گیلاس + بەیبون یەکی ٥٠ غم پاشان یەك کەوچك بۆ یەك پەرداخە ئاو سێ ژەم دوای کوڵاندن بۆ ۱۵ رۆژ بۆ إلتهاب و برینی گەدە .

٤٧)-گەڵاو گوڵی گوڵە بەرۆژە + قەزوانی شین + بەڵاڵوك یەکی ٥٠ غم + یەك لیتر ئاو پاش کوڵاندن سێ ژەم جاری یەك پەرداخ بۆ ماوەی ٥ رۆژ .

٤٨)-تۆوی شمماڵ گیر +تۆوی شویت بەهەردوکیان جاری ۱ کەوچك بۆ۱ پەرداخ ئاو۳ ژەم پاش کولاندن پێش نان خواردن .

٤٩)-تۆوی شمماڵ گیر ۲۰ غم + یەك پەرداخ ئاو پاش کوڵاندن سێ ژەم بخورێت بۆ غازات و ژان و با .

٥٠)-گوڵە با (بۆق کوژ)+بەڵەك +هەزبێ یەکی ٥٠غم تێکەڵ بکە پاشان ۲کەوچك بۆ یەك پەرداخ ئاو دوای کوڵاندن ۳ژەم بۆ ماوەی ۱٥ڕۆژ بۆ (التهابات ).

٥١)-ئاردی گەنم +ئاردی جۆ+لیمۆوشك یەکی(۱کغم) +۲لتر ئاو پاش کوڵاندن ۳ژەم پێش نان جاری یەك پەرداخ بۆ ماوەی ۱۰ڕۆژ .

٥٢)-سمل+وەنەوشە +زەنجەفیل+تۆوی بناوەج یەکی (٥٠غم) تێکەڵ بکە پاشان جاری ۲کەوچك بۆ ۱پەرداخ ئاو پاش کوڵاندن بەناشتا ڕۆژی ۲جار بۆ ماوەی ۱٥ڕۆژ بەردەوام .

٥٣)-تۆوی کاهو+وەنەوشە +کەرەوز یەکی ۱۰۰غم + ۱لیتر ئاو پاش کوڵاندن ۳ژەم بخورێ بۆ ماوەی ۱٥ڕۆژ بەردەوام.

٥٤)-عارەقی پونگە ۳ژەم ژەمی ۱پەرداخ بۆماوەی ۱۰ڕۆژ بەردەوام بەناشتا بۆ غازات و (التهابات ).

٥٥)-۲سەلك نێرگز +۱پەرداخ شیردێنی بۆ ماوەی ۱کات ژمێر (زیاتر نەمێنێتەوە چونکە خراپ دەبێت) پاشان بخورێت بۆ غازات و (التهابات )ی گەدە و ریخۆڵە.

٥٦)-تونەکە +گوڵە مێرۆ +گوڵە گوێزوان یەکیی ۱۰۰غم پاشان ۲ کەوچك چێشت بۆ ۱پەرداخ ئاو ۳ژەم پێش نان بۆ ماوەی ٥ ڕۆژ .

٥٧)-شاتوو (تووە سوورەی ترش) ۳ژەم ژەمی ۱پیاڵە پێش نان بۆ ماوەی ۱٥ڕۆژ بەردەوام.

٥٨)-توڵەکە +گوێز +وەنەوشە +گوڵزروان یەکی (٥٠غم )١کەوچك بۆ ١پەرداخ ئاو دوای کوڵاندن ڕۆژی ٢جار بۆ ماوەی ٧ڕۆژ .

٥٩)-گێلاس گەدە بەهێز دەکات ژەمی ٥٠غم . قۆخ گەدە بە هێز دەکات ژەمی ٥٠ غم.

٦٠)-گەڵاو گوڵی گێلاس + قەیتەران +ڕازیانە +ڕەشکە یەکی ٥٠ غم +١,٥لیتر ئاو بە سێ ژەم بخورێت لە ڕۆژێکدا بۆماوەی ١٥ ڕۆژ بەردەوام بێ.

٦١)-گوڵە حەریر جاری ٥٠غم پاش کوڵاندن سێ ژەم بخورێت بە ناشتا بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ.

٦٢)-هەڵوژە بەیانیان ١٠٠غم پێش نان بخورێت گەدە بە هێز دەکات و ڕیخۆڵە پاك دەکاتەوە قەبزی چاك دەکات.

٦٣)-گوێ مشك +وەنەوشە یەکی ٥٠ غم ژەمی یەك کەوچك چێشت بۆ یەك پەرداخ ئاو دوای کوڵاندن سێ ژەم پێش نان.

٦٤)-ڕزایانە سێ ژەم ژەمی یەك کەوچك بۆ یەك پەرداخ ئاو دوای کوڵان بخورێت ماوەی ٧ ڕۆژ بۆ ژان و با.

٦٥)-گوێ بەرخە +بەیبون یەکی ٥٠ غم بۆ دوو پەرداخ ئاو بە سێ ژەم لە ڕۆژێکدا بخورێتەوە دوای کوڵاندن.

٦٦)-٣٠غم ئاڵەت +٢٠غم زەنجەفیل + یەك کفم هەنگوین سێ ژەم ژەمی یەك کەوچك بخورێت بۆ گەدە و ڕیخۆڵە.

٦٧)-ماست +چای وشك بخورێت بۆ سکچون باشە .

٦٨)-بەڵەك + ڕازیانە + هێرۆ یەکی ٥٠غم نەمجا یەك کەوچك +یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت پاش نان بخورێت.

٦٩)-دۆشاوی گەزۆ ڕۆژی سێ جار جاری دو کەوچك بخورێت پاش نان . ڕۆنی گەرچەك ژەمی یەك پەرداخ بخورێت سێ ژەم بۆ گرفت و ئازاری ڕیخۆڵە .

٧٠)-تۆوی شاتەرە + شیر ٤ خەردل سپی + ماست هەفتەیەك دو جار بخورێت بۆ گەدەو ڕیخۆڵە.

٧١)-گوڵە بلاو (گوڵە کەرگ)جاری دوو کەوچك +دوو پەرداخ ئاو بکوڵێت بخورێت ڕۆژی سێ جار ماوەی ٥ ڕۆژ.

٧٢)-هەرێز +گەڵا گوێز +قەیتەران +پەیکوڵ +شمڵی +ڕەشکە یەکی ١٠٠ غم ڕۆژی سێ جار جاری یەك پیاڵە + دوو پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت سێ ڕۆژ چاك دەبێ.

٧٣)-گوێ بەرخە+ گەڵا گەزنە +گوڵی ماهور +ڕازیانە جاری یەک پەرداخ لە هەموویان وەک چا بکوڵێت بخورێ ڕۆژی سێ جار.

٧٤)-بەلالوک +بەیبون +مەزبێ جاری دوو کەوچک +١,٥ پەرداخ ئاو بکوڵێت بخورێت.

٧٥)-ڕەگی گەنم بە کوڵاوی جاری یەک پەرداخ لە ئاوە کوڵاوەکە بخورێت ماوەی ١٥ ڕۆژ بۆ هەو کردنی گەدە.

## هەوکردنی ناوخۆو منداڵدان (الإلتهابات الداخلية و الرحم)

١)-گەلاێی بیکوڵێنێ تا وەک دۆشاو خەست دەبێتەوە ژەمی ٢ کەوچک سێ ژەم ماوەی ٧ ڕۆژ بخورێت.

٢)-گوڵە بەیبون سێ ژەم ژەمی یەک کەوچک بۆ یەک پەرداخ ئاو دوای کوڵاندن بخورێت بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ .

٣)-سیر بەیانیان و ئێواران جاری ٥٠ غم ماوەی ٥ ڕۆژ بخورێت.

٤)-سیر + ڕەشکە + سرکەیەکی ١٠ غم بۆ یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت بەیانیان و ئێواران پێش نان بخورێت.

٥)-گەڵا کێلک +گەلاێی + عناب + چق چق یەکی ١٠٠ غم تێکەڵ بکە ئەمجا ١ کەوچک بۆ یەک پەرداخ ئاو ٣ ژەم دوای کوڵاندن بخورێت.

٦)-ئاوی هاز دوای کوڵاندن ١پەرداخ +١پیا لەسرکە ٣ژەم بخورێت.

٧)-بەڕوە سپی بە گەڵاکەوە بکوڵێ ٥٠ غم+١پەرداخ ئاو سێ ژەم بخورێت .

٨)-گوڵە هێرۆ + گوڵە وەنەوشە +قەیتەران یەکی ٥٠ غم پاشان یەک کەوچک بۆ یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت سێ ژەم بخورێت .

٩)-بەیبون +گوزروان +گوڵە باخ +تۆو گژنیژیەکی ٥٠غم تێکەڵ بکە دوایی یەک کەوچک بۆ یەک پەرداخ ئاو سێ ژەم دوای کوڵاندن بخورێت ١٠ڕۆژ.

١٠)-گوڵە هەژار +وەنەوشە +هێرۆ + زوفایەکی ٥٠ غم دوای یەک کەوچک بۆ دو پەرداخ ئاو بکوڵێت سێ ژەم بخورێت.

١١)-قنگر فرنگی +گەزنە +گوڵە پەنجە +قەیتەران +یەکی ٥٠ غم دوای یەک کەوچک بۆ یەک پەرداخ ئاو دوای کوڵاندن سێ ژەم ماوەی ٧ ڕۆژ.

١٢)-زیرەی رەش +رەشکە +رازیانە +تۆوی شوویت یەکی ٥٠ غم دوای کوڵاندن یەك کەوچك بۆ یەك پەرداخ ئاو سێ ژەم بخورێت بۆ ماوەی ١٥ رۆژ.

١٣)-ریش (گیا لەبان)+گوڵە مێرۆ +پەیکوڵ یەکی ٥٠ غم پاشان یەك کەوچك چێشت بۆ یەك پەرداخ ئاو دوای کوڵاندن سێ ژەم بۆماوەی ١٥ رۆژ .

١٤)-چق چقە رۆژی سێ ژەم ژەمی ٥٠ غم بۆ پەرداخێك ئاو دوای کوڵاندن پێش نان بخورێت ١٥ رۆژ بە بەردەوام.

١٥)-گوڵە نیلفۆرم +گوڵە گوێزوان +رەگی چق چقە یەکی ٥٠ غم بۆ پەرداخێك ئاو سێ ژەم دوای کوڵاندن بۆ ماوەی ٧ رۆژ .

١٦)-لیمۆی ترش سێ ژەم ژەمی یەك لیمۆ بخوات بۆ ماوەی ٧ رۆژ .

١٧)-گوڵە شەوبۆ یەك کەوچك لە هاڕاوەکەی + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت سێ ژەم بخورێت بۆ ماوەی ١٠رۆژ .

١٨)-هەرێز +پەیکوڵ +ژشکە +تۆوی شێلم یەکی ١٠٠غم یەك سەعات بکوڵێت دوای بە سێ ژەم بخورێت بۆ ماوەی ١٠ رۆژ .

١٩)-گیا ژانە (گیا ئازار)یەك کەوچك لە هاڕاوەکەی +یەك پەرداخ ئاو دوای کوڵاندن سێ ژەم پێش نان خواردن ماوەی ٧ رۆژ .

٢٠)-١٠٠ غم هەنجیر + دوو پەرداخ شیر بکوڵێت بە یانیان بخورێت ماوەی ١٥ رۆژ .

٢١)-قاقلی (شەماڵ گیر) +بەیبون+گژنیژ +هەزبی یەکی ١٠٠غم + دوو لیتر ئاو بکوڵێت سێ ژەم ژەمی یەك پیاڵە پێش نان ماوەی ١٠رۆژ .

٢٢)-ئاردی گەنم +ئاردی جۆ +لیمۆیەکی ٥٠ غم بۆ یەك پەرداخ ئاو سێ ژەم بخورێت دوای کوڵاندن ٧ رۆژ بەردەوام .

٢٣)-زەمقە شینە+زەنجەفیل +مقل ئزرق یەکی ٥٠ غم یەك کەوچك بۆ یەك پەرداخ ئاو دوای کوڵاندن بەیانیان و ئێواران ٥ رۆژ.

٢٤)-تۆوکاهو+وەنەوشە +کەرەوز یەکی ١٠٠غم + یەك لیتر ئاو بکوڵێت بە سێ ژەم پێش نان بخورێت ماوەی ١٠ رۆژ بەردەوام.

٢٥)-گەزنە +وەنەوشە +نەعنا +هەرێز +بەیبون یەکی ٢٥غم -یەك لیتر ئاو بکوڵێت لە رۆژێکدا بە سێ ژەم پێش نان بخورێت ماوەی ١٠ رۆژ بەردەوام.

٢٦)-گەزنە +بەیبون +رازیانە یەکی ٥٠ غم + یەك لیتر ئاو بە رۆژێك سێ ژەم پێش نان بخورێت ماوەی ٧ رۆژ بەردەوام.

٢٧)–مۆرد +پونگە+رازیانە یەکی ٥٠ غم یەك لیتر ئاو بە رۆژێك سێ ژەم پێش نان بخورێت ماوەی ٧ رۆژ بەردەوام.

٢٨)–وێنجە +رەشکە/یەکی ٥٠ غم + یەك کەوچك بۆ یەك پەرداخ ئاو بکولێت بە بانیان و ئێواران سێ رۆژ.

٢٩)سێ پەرە+وەنەوشە +بەیبون +یەکی٥٠غم بۆ پەرداخێك ئاو سێ ژەم ماوەی ٧ رۆژ.

٣٠)–گوێژ +گوڕوان +ریشی گەنمە شامی یەکی ١٠٠ غم +١٠٠ غم هەرێز + ١٠٠ غم گەزنە +١٠٠غم قەیتەران +٢،٥ لیتر ئاو بکولێت و پاشان لە ماوەی ٢٤سەعات بخورێت ٥ شەو رۆژ بەردەوام بخورێت.

٣١)–رەگی پونگە + هەرێز رەگەکەی +بەیبون +قەیتەران +شەلی ١٥٠ غم ئەمجا یەك پیاڵە + دوو پەرداخ ئاو بکولێت و بخورێتەوە وە رۆژی سێ جار بۆ ١٥ رۆژ بۆ هەوکردنی ناوخۆ.

٣٢)–پێستی گڵدار یان دارودم دوو کەوچك +یەك پەرداخ ئاو بکولێت و بخورێت بۆ ناو خۆ زۆر چاکە.

٣٣)–کولیجان +دارچین +زەنجەفیل یەکی ١٠٠غم ئەمجا یەك کەوچك +یەك پەرداخ ئاو دوای کوڵاندن بخورێ بە ناشتا رۆژی سێ جار بۆ ١٥ رۆژ بۆ إلتهاباتی داخلی.

٣٤)–گوڵە سارێژ (گوڵە موسی)+قەیتەران +گەڵا بی +شەلی یەکی ١٥٠ غم دوو کەوچك بۆ یەك پەرداخ ئاو بکولێت سێ ژەم ماوەی ٧ رۆژ بخورێت.

٣٥)–گوڵە خەڵات +هەزبی یەکی ١٠٠ غم پاشان دوو کەوچك بۆ یەك پەرداخ ئاو سێ ژەم بخورێت ماوەی ١٠ رۆژ.

٣٦)–پونگە +نەعنا یەکی ٥٠ غم +یەك پەرداخ ئاو دوای کوڵان سێ ژەم بخورێت ماوەی ١٠ رۆژ.

٣٧)–نەعنا +پونگە +رازیانە +گژنیژ +بەیبون + زبی یەکی ٥٠ غم +یەك لیتر ئاو سێ ژەم بخورێت ماوەی٧رۆژ بەردەوام بێت.

٣٨)–مۆرد +گەڵا بەڕو +مازو یەکی ٥٠ غم + یەك لیتر ئاو دوای کوڵان ژەمی پەرداخێك سێ ژەم ٥ رۆژ بەردەوام بخورێت.

٣٩)–رەشکە +تۆوی شوویت +گژنیژ یەکی ٥٠ غم +یەك لیتر ئاو سێ ژەم ژەمی یەك پەرداخ ٧ رۆژ بەردەوام.

٤٠)–٢٠٠غم رەشکە +یەك کفم هەنگوین ٤ ژەم ژەمی ٢٥٠غم بخوات سێ رۆژ بەردەوام .

٤١)-ترشە سماق سێ ژەم ژەمی ٥٠ غم +یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت ماوەی ٧ڕۆژ.

٤٢)-ڕەشکە +رازیانە +قەیتەران یەکی ٥٠غم +یەک پەرداخ ئاو بۆ یەک جار سێ جار بخورێت دوای کوڵان ماوەی ٧ ڕۆژ بەردەوام.

٤٣)-گوێ بەرخە +بەیبون یەکی ٥٠ غم +یەک پەرداخ ئاو بۆ یەک جار سێ ژەم لە ڕۆژێکدا بخورێت دوای کوڵان ماوەی ٥ ڕۆژ بەردەوام.

٤٤)-گەڵا رکێشە +گەزنە یەکی ٥٠غم +دوو پەرداخ ئاو سێ ژەم بخورێت ماوەی ٧ ڕۆژ دوای کوڵان.

٤٥)-جعفری ١٠٠غم +گەڵا گوێز ١٠٠غم +ریشی گەنمەشامی ١٠٠غم بکوڵێت ڕۆژی سێ جار بخورێت بۆ(التهاباتی داخلی) ژنانە.

٤٦)-بەرو بە جەوتەوە ٥٠غم +دوو پەرداخ ئاو بکوڵێت بە دوو ژەم بخورێت بۆ منداڵدانی ژنان کە خزا بێ ڕۆژباشە ١٥ ڕۆژ بخورێ.

٤٧)-خەردل سپی +زەنجەفیل لە هەردووکیان یەک کەوچک +یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت بخورێت ڕۆژی دوو ژەم ماوەی ٧ ڕۆژ بۆ رەحیەژنان.

٤٨)-مێوە مارانە (١٠ )دەنک لە توێوەکەی بخوات بە یەک جار منداڵ لە بار دەبات یان سێ ژەم ژەمی ٥ پێنج دەنک بخوات لە باری دەبات.

٤٩)-تۆوەگێزەر +تۆوی شوێت +تۆو کەرەوز +تۆو شەلی یەکی ٥٠ غم +١٠٠غم نبات ئەمجا ڕۆژی سێ جار جاری دوو کەوچک +١,٥ لیتر ئاوبکوڵێت و بخورێت بۆ حەساسیەتی منداڵدان.

٥٠)-گوڵە هێرۆ +گوڵە بەیبون یەکی پیاڵەیەک +خەنە +ئاو بیگرێتەوە بدرێ لە ماڵیکەشەو حەساسیت و میکروبی نامێنێ ١٥ ڕۆژ.

٥١)-گەزنە +بەیبون +گوڵە گوزروان +گوڵی پونگە +قازی ئاغا +قەیتران +تۆڵەکە بە وشکی یەکی ١٠٠ غم بهاڕە وە ئەمجا یەک پیاڵە +دوو پەرداخ ئاودا وەک چا بکوڵێت و ئاوەکە بخورێتەوە ڕۆژی سێ جار پێش نان خواردن بۆ ماوەی ١٥ ڕۆژ چارەسەری إلتهاباتی منداڵدان دەکات.

٥٢)-ڕەشکە +رازیانە +تۆوی خەرتەلەیەکی ٢٥٠ غم +یەک کغم هەنگوین تێکەڵاو بکرێت بەیانیان بە ناشتا نیوەڕۆ و ئێواران پێش نان سێ کەوچک بخوات بۆ منداڵدان .

٥٣)-رازیانە ٥٠ غم +تۆوی خەردل ٥٠ غم بە کوتراوی ئەمجا جاری یەک کەوچک چێشت +یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێتەوە بۆ ٥ رۆژ نەخۆشی ژنانە چارەسەر دەکات.

٥٤)-٥٠ غم مازو +٥٠ غم بەڕو بکرێتە ناو تەشتێک ئاوی شلەتێن ماوەی (٢٠) دەقیقە تیادا بنیشێ رۆژی یەک جار سێ رۆژ بۆ رەحم کە داخزابێ چاک دەبێ.

٥٥)-گەزنە +بەیبون +گوڵە هێرۆ +رازیانە +پونگە +گەڵا گوێژ +مۆرد یەکی ١٠٠ غم ئەمجا یەک پیاڵە +دوو پەرداخ بخورێتەوە رۆژی دوو جار ١٥ رۆژ نەخۆشی ژنانە.

٥٦)-گژدارێیان (دارۆزم)دووکەوچک +یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت وەک چا بخورێت بۆ إلتهاباتی منداڵدان . پێستی دارەکەی گژدارێیان.

٥٧)-بەری دار مەڵحەم +بەیبون +گەزنە +گوڵی پونگە +قازی ئاغا بە ئەندازە ئەمجا جاری دوو کەوچک +یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت رۆژە سێ جار بخورێت بۆ ئازاری رەحم.

٥٨)-گیا خاوێ +گەزنە +بەیبون یەکی یەک کەوچک +یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێ ماوەی ١٥ رۆژ رۆژی سێ جار بۆ ئازاری(عادەو إلتهاباتی رەحم).

٥٩)-جەوت +مازو +گزگل بە کوتراوی +پێستی رنەکراوی ورگی سەرو پێ (کلاو قازی)هەموی بهارێت +هەنگوین بکرێ بە لفاف و بکرێ بە شاف بۆ رەحم بۆ داخزانی رەحم.

٦٠)-مازو +بێچکە +جەوت +گزگل +توێکڵی شوتی+ توێکڵی هەنار لە هاراوەی هەمویان +لفاف +شیلەی هەنگوین بکرێ بە شاف بۆ رەحم رۆژی دوو جار ماوەی ٨ رۆژ بۆ داخزانی رەحم.

٦١)-گەزنە +رازیانە +قازی ئاغا یەکی ١٠٠غم دوای دو کەوچک +سێ پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت بۆ نەخۆشی منداڵدان.

٦٢)-سەبر +شۆرە +باروت +گوڵی پونگە +چەوری بزن+توێکڵی هەنار بکری بە شاف ژن و پیاو لە پێشەوە هەڵی بگرێ بۆ إلتهاباتی جنسی و منداڵدان دەبێ شافی پیاوەکە باریک بێ وەک دەنکە شقارتە بکرێتە ناو کونی زەکەری.

٦٣)-گەزنە +قازی ئاغا +گوڵی پونگە +مقل الأزرق +رۆن گەرچەک بیان کوتە بیانکە بە شاف بۆ ژن و پیاو لە پێشەوە بۆ خۆیانی هەڵبگرن بەڵام شافی پیاوەکە باریک بێ وەک دەنکە شقارتە بۆ کونی زەکەری بۆ إلتهاباتی رە حم و جنسی پیاو.

## هەوکردنی جگەر و نەخۆشی زەردوویی وکیسەی صفرا

١)-گوڵاڵە سورە یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت بۆ جارێك ٥ رۆژ بۆ سەفرا.

٢)-ئاوی تور + ئاوی هەڵوژە دوو پیاڵە لە هەریەکیان بۆ جارێك سێ ژەم بخورێ ماوەی ٥ رۆژ بۆ زەردویی و هەوکرنی جگەر.

٣)-ئاوی هەنارگترش سێ پیاڵە + ئاوی شوتی سێ پیاڵە + ئاوی گێزەر دوو پیاڵە بۆ ژەمێك پێش نانبخورێ ماوەی ٧ رۆژ بۆ سەفرا.

٤)-میوە مارانە ٣٠ غم + هەزبێ ٢٠ غم + گوڵە گوزروان ١٠٠ غم تێکەڵاوی بکە ئەمجا ٤ کەوچك + دوو پەرداخ ئاو بکوڵێت بە دوو ژەم بخورێ ماوەی ٧ رۆژ بۆ سەفرا.

٥)-دۆشاوی تورك + یەك لیتر ئاو رەگی چەق چەقبکوڵێت رۆژی سێ جار جاری یەك پەرداخ بخورێت بۆ ماوەی ١٥ رۆژ بۆ سەفرا.

٦)-گوڵە بڵاو (گوڵە کەرگ) دوو کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت رۆژی سێ جار ماوەی ٥ رۆژ بۆ سەفرا.

٧)-شنگ + رەشکە + پەیکوڵ + رازیانە ٥٠ غم + یەك لیتر ئاو بکوڵێت بە دوو جار بخورێت لە رۆژێکدا ماوەی ٧ رۆژ بۆ کیسەی سەفرا.

٨)-تریێ(ئاوی تریێ)ژەمی دوو پەرداخ بۆ زەردویی و هەوکردنی جگەر باشە ١٥ رۆژ بەردەوام بخورێت.

٩)-گەڵا و توێکڵسورە چنار + گەڵا بی + گەڵای هەڵوژە لە هەرسێکیان جاری ١٥٠ غم+دوو پەرداخ ئاو بکوڵێت بە دوو جار لە رۆژێکدا بخورێ ماوەی ٧ رۆژ.

١٠)-بۆ پاکردنەوەی کیسەی سەفرا خواردنی میوە ترشەکان زۆر باشە .

١١)-قەیتەران + هەزبێ + رەگی هەرێز + گەڵا گوێژ + گوڵە گوزروان یەکی ١٠٠ غم ئەمجا یەك پیاڵە + دوو پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت سێ ژەم بە ناشتا بۆ بەردی سەفرا .

١٢)-تالیشك دوو کەوچك بەوشکراوی + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت وەك چا بخورێتەوە رۆژی سێ جار ماوەی ١٠ رۆژ چارەسەری کیسەی سەفراو زەربووبی دەکات .

١٣)-مارلاوەی گیلە هەنگوین + گەزنە + بەیبون + یەکی ١٥٠ غم دوالی یەك پیاڵە + ١,٥ لیتر ئاو بکوڵێت رۆژی سێ جار بخورێت بۆ بەردی سەفرا و زەردویی زۆر باشە .

١٤)-گیای شەمامە + گیای گوڵزوان بە کوترلوی یەك پیالە + دوو پەرداخ ئاو بکولێنت رۆژی سێ جار بۆ نەخۆشی جگەر وسەفرا و زەردویی .

١٥)-کاکڵ زەرد ٤ ژەم ژەمی یەك کەوچك بۆ یەك پەرداخ ئاو دوای کولان بخورێت بۆ ماوەی ٥ رۆژ + پارێز بکات لە چەوری و گۆشت و هێلکە.

١٦)-شملی سێ ژەم ژەمی یەك کەوچك بۆ یەك پەرداخ ئاو دوای کولان بخورێت +پارێز لە چەوری وگۆشت وهێلکە .

١٧)-١٠٠ غم رەشکە +یەك کفم هەنگوین سێ ژەم ژەمی دوو کەوچك چێشت پێش نان بخورێت + پارێز .

١٨)-دارچینی یەك کەوچك چا بۆ یەك پەرداخ ئاوی کوڵ و بخورێت بە یانیان بۆ ماوەی یەك مانگ + پارێز .

١٩)-تەرەتیزە +توور +کەلەرم بۆ چارەسەری سفرا زۆر باشە .

٢٠)-٥٠ غم گەڵا کەلەرم +یەك پەرداخ ئاوی لیمۆ بە یانیان و ئێواران بۆ لابردنی سەفرا .

٢١)-عەرەقی گەڵا بی +عەرەقی چق چقە +عەرەقی نەعنا +عەرەقی شاتەرە جاری پیاڵەیەك پێش نان سێ ژەم .

٢٢)-عەرەقی بی +عەرەقی چەق چەقە +عەرەقی کاهو یان ئاوی کاهو سێ ژەم ژەمی یەك پیالە.

٢٣)-خواردنی ماسی بۆ ماوەی (٢-٣)هەفتە زۆرباشە .

٢٤)-جۆ+ رەگی هێرۆ +گوڵە وەنەوشە یەکی ١٠٠ غم + سێ لیتر ئاو سێ ژەم دوای کولان جاری یەك پەرداخ .

٢٥)-تۆڵەکە مارانە ٥٠ غم + یەك پەرداخ ئاو سێ ژەم بخورێت بۆ ماوەی ١٥ رۆژ بەردەوام.

٢٦)-گەڵا کێکف +گەڵا بی +چەقە چقە +عەناب یەکی ١٠٠ غم دوای یەك کەوچك بۆ یەك پەرداخ ئاو بکولێنت سێ ژەم بخورێت ١٠رۆژ .

٢٧)-بۆژانە زەردە یەك کەوچك لە گەڵاو گوڵەکەی + یەك پەرداخ ئاو دوای کولان بە گەرمی بخورێت رۆژی سێ جار.

٢٨)-١٠٠ غم کاشمە +١٠٠ غم زنیان +١٠٠غم رازیانە +١٠٠ غم گوڵە پەنجە + ٥٠ غم رەشکە + ٥٠ غم شملی + ٢ لیتر ئاو دوای کولان سێ ژەم ژەمی یەك پەرداخ ٢٠ رۆژ .

۲۹)–ئاورگ گەڵاو گوڵی +گەڵا بی +مەرزنە جۆش یەکی ۲۰۰غم جاری یەک کەوچک بۆ یەک پەرداخ ئاو بەیانیان و ئێواران بخورێت .

۳۰)–گیای گوڵە گەنم سێ ژەم جاری یەک کەوچک بۆ یەک پەرداخ ئاو دوای کوڵان بخورێت ۱۰ ڕۆژ بەردەوام بۆ زەردوێی .

۳۱)–تەماکۆ جنانی +گیای گەزنە +پیکول یەکی ۱۰۰ غم دوای یەک پیاڵە بۆ دوو پەرداخ ئاو دوای کوڵان سێ ژەم بخورێت بۆ ۱۰ ڕۆژ .

۳۲)–گوڵە میمون یان گوڵە ئاوات سێ ژەم ژەمی ۵۰ غم بۆ پەرداخێک ئاو وەک چا بخورێتەوە ۱۵ ڕۆژ بەردەوام .

۳۳)–کەرموز +گەڵا گوێژ +قەیتەران +پەیکوڵ +گوڵە گوزروان یەکی ۵۰ غم پاشان سێ ژەم ژەمی یەک کەوچک بۆ یەک پەرداخ ئاو بیکوڵێنە وبخۆرەوە .

۳٤)–۵۰ غم هەمیشە بهار +یەک پیاڵە سرکە پاش کوڵان بە ڕۆژێک لە سێ ژەما بخورێت سێ ڕۆژ بەردەوام بخورێت .

۳۵)–یەک پەرداخ ئاوی خەیار +یەک پەرداخ ئاوی شووتی +۱۰۰غم گەڵای تورک +یەک لیتر ئاو دوای کوڵان ڕۆژی یەک پەرداخ بخوات .

۳٦)زیرەی ڕەش +ڕەشکە +تۆوشویت +ڕازیانە یەکی ۱۰۰ غم پاشان یەک کەوچک بۆ یەک پەرداخ ئاو دوای کوڵان بخورێت زەردوێی سەفرا لا دەبات.

۳۷)–سینامەکی +وەنەوشە +زنیان یەکی ۱۰۰ غم دوای یەک کەوچک لەگەڵ یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت بۆ زەردوێی.

۳۸)–یەک کەوچک چەق چەق+یەک کەوچک گوڵە باخ +یەک پەرداخ ئاو دوای کوڵان بخورێت سێ ژەم بۆ زەردوێی.

۳۹)لیمۆی شیرین ڕۆژی سێ جار جاری یەک پەرداخ ئاوی لیمۆی شرین بخورێتەوە بۆ زەردوێی.

٤۰)–لیمۆی ترش سێ ژەم ژەمی یەک پەرداخ ئاوەکەی بخورێت بۆ زەردوێی .

٤۱)–بەیانیان یەکەم جار یەک پەرداخ ئاوی لیمۆی ترش بخورێتەوە دوای ۱۵ دەقیقە سێ پەرداخ ئاوی شوتی بخورێت بۆ زەردوێی.

٤۲)–هەرێز +ڕەشکە +پیکوڵ یەکی ۱۰۰ غم +۵۰۰غم تۆو شێلم +دوو لیترئاو دوای یەک سەعات کوڵان هەموی بە سێ ژەم بخورێت بۆ زەردوێی بۆ ۱۰ ڕۆژ.

٤٣)-یەک کەوچک گەڵاو گوڵی شەوبۆی زەرد + یەک پەرداخ ئاو دوای کوڵان ڕۆژی سێ جار بخورێت بۆ زەردویی.

٤٤)-گێزەر +ڕازیانە +سەلمکە یەکی ١٠٠ غم بۆیەک لیتر ئاو دوای کوڵان سێ ژەم ژەمی یەک پەرداخ بخورێت بۆ زەردویی.

٤٥)-کرۆکی کەرتەشی (شەکرۆکە) +تۆوی هێرۆ یەکی یەک کەوچک +یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت ڕۆژی سێ ژەم بخورێت ١٥ ڕۆژ بۆ زەردویی .

٤٦)-١٠٠غم هەنجیر +دوو پەرداخ شیر دوای کوڵان بە یانیان بخورێت بۆ زەردویی بۆماوەی ١٥ ڕۆژ بەردەوام.

٤٧)-بەیبون +گوڵە گوڵزروان +تۆوی گژنیژ +گوڵە باغ یەکی ١٠٠غم تێکەڵ بکە دوایی یەک کەوچک + یەک پەرداخ ئاو دوای کوڵان ڕۆژی سێ ژەم ١٠ ڕۆژ بۆ زەردویی .

٤٨)-١٠٠ غم قناوڵی +١٠٠ غم قەیتران +٥٠غم شملی دوایی یەک کەوچک+ یەک پەرداخ ئاو دوای کوڵان ڕۆژی سێ جار بخورێت ١٠ڕۆژ بۆ زەردوی.

٥٠)-١٠٠ غم کولەکە + یەک پەرداخ ئاو دوای کوڵان ڕۆژی سێ جار بخورێت بۆ بەردی صفرا باشە ١٥ ڕۆژ بەردەوام.

٥١)-قنگرە کەرانە (قنگر فەرەنگی) +گەزنە +گوڵە پەنجە +قەیتەران یەکی ٢٠٠غم + یەک لیتر ئاو سێ ژەم جاری یەک پەرداخ دوای کوڵان ١٠ ڕۆژ بەردەوام بۆ صەفرا.

٥٢)-ریشەن +پیکوڵ +گوڵە هیرۆ یەکی ١٠٠غم تێکەڵ بکە ئەمجا دوایی یەک کەوچک+یەک پەرداخ ئاو بەیانیان و ئێواران ١٥ ڕۆژ بۆ إلتهاباتی جگەرو زراو و صفرا .

٥٣)-(بەهێ)خواردنی بەهێ بە هەر شێوەیەک بێ بە کاڵی یان بە کوڵاوی یان برژاوی سودی زۆری هەیە بۆ صفرا و زەردویی .

٥٤)-گیای نیلوفەر + گوڵە گوڵزروان +ڕەگی چەقە چەقەیەکی ٥٠ غم تێکەڵ بکە دوایی یەک کەوچک بۆ یەک پەرداخ ئاو دوای کوڵان سێ ژەم ١٥ ڕۆژ بخورێت بۆ زەردویی .

٥٥)-(تووە فەرەنگی) خواردنی یەک پیاڵە تووی فەرەنگی بۆ ژەمێک ڕۆژی سێ جار پێش نان بخورێت بۆ زەردویی .

٥٦)-گوڵە سوسن +کونجی +بەیبون یەکی ١٠٠ غم دوایی یەک کەوچک بۆ یەک پەرداخ ئاو دوای کوڵان بخورێت ڕۆژی سێ جار یەک ڕۆژ بۆ هەوکردنی صفرا .

٥٧)-(بامیە)گەڵاکولەکەی +نەعنا +گوڵە گوڵزروان دوای کوڵان بخورێت ڕۆژی سێ ژەم پێش نان ماوەی ١٠ ڕۆژ بۆ صفرا.

٥٨)-سوسی گەنم +سوسی جۆ +لیمۆی ووشك یەكی یەك كفم + دوو لیتر ئاو دوای كوڵان ڕۆژی سێ ژەم ژەمی یەك پەرداخ ١٠ ڕۆژ بخورێت بۆ صفرا .

٥٩)-تۆوەكاهو +گوڵە وەنەوشە +كەرەوز یەكی ١٠٠غم + یەك لیتر ئاو دوای كوڵان ڕۆژی سێ ژەم جاری یەك پەرداخ بۆ بەردی صفرا ١٠ ڕۆژ بەردەوام .

٦٠)-گوڵە هەرار +گوڵە وەنەوشە +دارچینی یەكی ٥٠ غم دوای تێكەڵ كردن یەك كەوچك بۆ یەك پەرداخ ئاو دوای كوڵان بخورێت سێ ژەم ١٠ ڕۆژ بۆ صەفرا .

٦١)-گوڵی ڕەشە دەرمان +گوڵە گوێزوان +گوڵە هێرۆ یەكی ٥٠ غم دوای تێكەڵ كردن یەك كەوچك بۆ یەك پەرداخ ئاو دوای كوڵان سێ ژەم ١٠ ڕۆژ بۆ صفرا .

٦٢)-بەیبون +گەزنە +ڕازیانە یەكی ٥٠ غم دوای تێكەڵ كردن یەك كەوچك بۆ یەك پەرداخ ئاو سێ ژەم ١٠ ڕۆژ بەردەوام بۆ زەردویی .

٦٣)-شاتو (توە سورە)بەیانیان یەك پەرداخ لە ئاو وشەربەتە ترشەكەی بخورێت بۆ ماوەی ١٥ڕۆژ بەردەوام بێت بۆ صفرا .

٦٤)-پسڵ (گیا دۆخەوا)١٠٠ غم + یەك لیتر ئاو دوای كوڵان بە ڕۆژێك بە سێ ژەم بیخوات ٧ ڕۆژ بەردەوام بێت بۆ صفرا .

٦٥)-گەڵا گوێز + گوێزوان +ڕیشی گەنمەشامی +قەیتران +هەرێز +گەزنەی زەرد یەكی ١٠٠ غم + ٢,٥ لیتر ئاو دوای كوڵان لە ٢٤ سەعات دا بخورێتەوە ٥ ڕۆژ بۆ صفرا .

٦٦)-گوڵە موسی (گوڵە سارێژ)+ قەیتران +گەلابی +شملی یەكی ١٥٠ غم دوای دوو كەوچك بۆ یەك پەرداخ ئاو دوای كوڵان ڕۆژی دوو جار ١٠ ڕۆژ بۆ صفرا .

٦٧)-عارەقی پونگە یان نەعنا سێ ژەم ژەمی یەك پیاڵە ١٠ڕۆژ بەردەوام بۆ صفرا .

٦٨)-١٠٠غم رەشكە + ١٠٠ غم شملی + دوو لیتر ئاو ئەمجا ٥ پەرداخ بخورێت لە ڕۆژێكدا بۆ زەردویی و صفرا .

٦٩)-گەڵا و قنچكی گیلاس + قەیتەران +ڕازیانە +ڕەشكە یەكی ٥٠ غم + ١,٥ لیتر ئاو بە ڕۆژێك سێ جار بخورێتەوە بۆ ٧ ڕۆژ بۆ كیسەی صفرا .

٧٠)-قۆخ بۆ ئەوانەی كیسەی صفریان بێ هێزە بیخۆن زۆر باشە كیسەی صفرایان بەهێز دەكات .

٧١)-ڕازیانە +قەیتەران +ڕەشكە یەكی ١٠٠ غم تێكەڵ بكە دوای یەك كەوچك بۆ پەرداخێك ئاو ڕۆژی سێ جار بیخوات ٧ ڕۆژ بۆ كیسە صفرا .

٧٢)-گیا ڕکێشە +گەزنە یەکی ٥٠ غم دوای یەک کەوچک بۆ یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت سێ ژەم بۆ ماوەی ٧ ڕۆژ بۆ بەردی صفرا .

٧٣)-گەزۆ شۆکە و هەنگوین خواردنیان سێ ژەم بەکەڵکە بۆ زەرویی و هەوکردنی جگەر.

٧٤)-شوتی ئاوەکەی سێ ژەم ژەمی یەک پەرداخ بخورێت بۆ زەردویی.

٧٥)-٥٠ غم گەڵاو گوڵی بستە بکوڵێت + یەک پەرداخ بۆ ژەمێک ڕۆژی دو جار بخورێ ماوەی ٧ ڕۆژ بۆ زەردویی .

٧٦)-گەڵا بی ڕەگەکەی ٥٠ غم + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت سێ ژەم ماوەی ١٠ ڕۆژ بخورێت بۆ زەردویی .

٧٧)-پەڵپینە + پەیکوڵ +زنیان یەک کەوچک لە هەموی + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت ڕۆژی دو جار بخورێت ماوەی ٧ ڕۆژ بۆ بەردی صفرا .

## نەخۆشییەکانی شەکرەو فشاری خوێن

١)- گەڵا بی ١٠٠ غم + یەك پەرداخ ئاو بە دووژەم بخورێت لەرۆژێکدا ٧ رۆژ بەردەوام بۆ شەکرە باشە .

٢)-ئاوی ماست دوای ئەوەی ماستەکە کرابە تورەکەوە بەیانیان دوو پیاڵە بە ناشتا شەویش دو پیاڵە .

٣)-بە یانیان١٠ غم زەیتون وەك چا بکوڵێت ماوەی ١٥ رۆژ بە کاری بهێنێت شەکرەی نامێنێ .

٤)-ئاوی ماست یان ئاوی دۆ بە یانیانبە ناشتا وئێوارانوشەوان بخورێت فشاری خوێن نزم ئەبێتەوە .

٥)--٥٠غم گەڵا کەلەرم +دوو پیاڵە ئاوی لیمۆ بۆ ژەمێك بە یانیان و ئێواران بۆ ماوەی ١٠ رۆژ بۆ شەکرە و زەحمەتی خوێن .

٦)--١٠٠ غم گەزنە +١٠٠ غم گوڵە پونگە دوای یەك کەوچك لەم تێکەڵەیە+ یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت رۆژی سێ جار بۆ شەکرە و بەرزی خوێن بۆ ١٥ رۆژ .

٧)-سەبر (صبره زەردە)٥٠ غم لەسەلك و رەگی + ٥٠ غم جۆ + پەرداخێك ئاو بەیانیان بە ناشتا سێ رۆژ بەردەوام بۆ(جلده)زۆر باشە .

٨)-جۆ ورج +پەیکوڵ + گەڵا گوێز +گەڵا گەزنە یەکی ٥٠ غم + دوولیتر ئاو دوای کوڵان سێ ژەم ژەمی یەك پەرداخ بخورێت بۆ شەکرە و پاك کردنەوی خوێن .

٩)-گەڵا کێکف +چق چقە +گەڵابی +عەناب یەکی ١٠٠ غم دوای سێ ژەم ژەمی یەك کەوچك بۆ یەك پەرداخ ئاو دوای کوڵان بخورێت بۆ شەکرە .

١٠)-بۆژانە ٠,٥ کەوچك + ٠,٥ پەرداخ ئاو دوای کوڵان بە یەك ژەم بە یانیان و ئێواران پێش نان بخورێت ماوەی ٥ رۆژ بۆ شەکرە .

١١)-کاشمە+رەشکە + شملی یەکی ١٠٠غم تۆوشویت +یەك لیتر ئاو بە رۆژێك بخورێت بە سێ ژەم پێش نان خواردن ماوەی ١٠ رۆژ فشاری خوێن لا دەبات .

١٢)-کەرکوڵ ژەمی دو کەوچك لە گەڵاو گوڵکەی + یەك پەرداخ ئاو وەك چا بکوڵێت و بخورێت سێ ژەم بۆ فشاری خوێن .

١٣)-(تەرخون)ئەوانەی فشاری خوێنیان هەیە تەرخون بخۆن لە باتی خوێ زۆرباشە فشارەکەیان بەرزنابێتەوە ،

١٤)-بادامە تاڵە(چەقالە)بۆ کەم کردنەوەی شەکرە باشە زەختیش دادەبەزێنێ .

١٥)-بناوە تۆم ٥٠ غم +یەک پیاڵە ماست بە یانیان و ئێواران بخورێت بۆ زەخت و شەکرە زۆرباشە .

١٦)-جافری کێوی (کەرەوزی کێوی) خواردنی زەخت لادەباو خوێن پاک دەکاتەوە .

١٧)-کەرەوزی کێوی +سیر یەکی ٥٠ غم + یەک پەرداخ ئاو دوای کوڵان بخورێت ڕۆژی دوو جار بۆ کەم کردنەوەی فشاری خوێن زۆرباشە .

١٨)-تەنەکەڕێ + مێوە مارانە + تۆڕابناوە تۆم یەکی کەوچکێک + ماست شەو کاتی خەوتن بخورێت بە یانیان بە ناشتا شەکرە لا دەبا .

١٩)-کەرەوز یەک کەوچک + یەک کەوچک سیر + یەک پەرداخ ئاو دوای کوڵان بپاڵێورێ بۆ یەک ژەم بە یانیان و ئێواران بخورێت ١٠ ڕۆژ بۆ شەکرە زۆر باشە .

٢٠)-٥٠غم رەگی مێو مارانە +٥٠ غم رەشکە ئەمجا یەک کەوچک بۆ یەک پەرداخی ئاو بکوڵێنرێت سێ ژەم بخورێ بۆ ١٠ ڕۆژ شەکرە زۆر باشە .

٢١)-یەک کەوچک چا گوژاڵك +پیاڵەیەک ماست بە یانیان بە ناشتا وەشەو بخورێت ماوەی ١٠ ڕۆژ شەکرە دادەبەزێنێ .

٢٢)-یەک کەوچک چەق چەقە + یەک کەوچک رازیانە + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت وەک چا بخور ێت بە یانیان و ئێوارلن ١٠ ڕۆژ بۆ شەکرە و زەخت .

٢٣)-گەڵا گوێز ١٠٠ غم + سێ پەرداخ ئاو بکوڵێت و بە سێ ژەم بە ناشتا بخورێت بۆ شەکرە ئەگەر لەگەڵ رازیانەدا بێ زەختیش دادەبەزێنێ .

٢٤)-لیمۆی ترش سێ ژەم ژەمی یەک پەرداخ لە ئاوەکەی بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ زەختی خوێن دادەبەزێنێ خوێن پاک ئەکاتەوە .

٢٥)-کرۆکی کەرتەشی یان چەورۆکەی کەرتەشی جاری یەک کەوچک + یەک پەرداخ ئاو دوای کوڵاندن سێ ژەم بخورێت شەکرە چارە دەکات .

٢٦)-١٠٠ غم گەڵای دار بناوەتۆم + ١٠٠ غم گەڵا گوێز + دوو لیترئاو دوای کوڵان سێ جار بخورێت پێش نان لە ڕۆژێکا جاری دوو پیاڵە ماوەی ٧ ڕۆژ بۆ زەخت .

٢٧)-توی فەرهەنگی ڕۆژی جاری یەک پیاڵە پێش نان بخورێت بۆ زەخت باشە .

٢٨)-گەڵا و گوڵی بامیە + نەعنا + گوڵە گوزروان + یەك لیتر ئاو بە سێ جار لە رۆژێکدا دوای کوڵان ئاوەکە بخورێ بە ناشتا بۆ ١٠رۆژ بۆ زەخت .

٢٩)-سمل یەك کەوچك + یەك پەرداخ شیر بۆ یەك جار سێ ژەم بخورێت بۆ پاڵە پەستۆی خوێن و شەکرە .

٣٠)-تۆو کاهو +گوڵە وەنەوشە +کەرەوز یەکی ١٠٠ غم + یەك لیتر ئاو دوای کوڵان بەرۆژێك بە سێ جار بخورێت بۆ ١٠ رۆژ شەکرە دادەبەزێنێ .

٣١)-گەزنە +گوڵە گوزروان +گوڵە بەیبون +نەعنا +رەگی هەرێز یەکی ٥٠غم + دوو لیتر ئاو ژەمی یەك پەرداخ دوای کوڵان سێ ژەم بۆ ٧ رۆژ بۆ شەکرەو زەخت .

٣٢)-گوڵە هەوار +گوڵە گوزروان +دارچینی یەکی ٥٠ غم دوای یەك کەوچك بۆ یەك پەرداخ ئاو دوای کوڵان رۆژی دوو جار بۆ شەکرە و زەخت .

٣٣)-شاتوە سورەی ترش سێ ژەم یەك پیاڵە بۆ ماوەی ١٥ رۆژ بۆ دابەزینی پاڵە پەستۆی خوێن و شەکرە .

٣٤)-تۆڵەکە +گەڵا گوێز +وەنەوشە +گوزروان یەکی ٥٠ غم ئەمجا ٢ کەوچك بۆ یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت رۆژی ٢ جار بۆ ٧ رۆژ بۆ شەکرەو خوێن پاککردنەوە .

٣٥)-گەڵا گوێز +گوزروان +ریشی گەنمەشامی + قەیتەران +گەزنە +هەرێز یەکی ٥٠ غم+٢,٥ لیتر ئاو بکوڵێت لە ٢٤ سەعات دا بخورێتەوە ماوەی ٥ رۆژ .

٣٦)-زەیتون ئاوی میوەکەی بگیرێ رۆژی سێ جار جاری یەك کەوچك بە ناشتا بخورێت ماوەی ١٥رۆژ بۆ شەکرە و پاڵە پەستۆی خوێن .

٣٧)-ترشە سماق رۆژی سێ جار جاری یەك کەوچك بۆ یەك پیاڵە ئاو وەك چابخورێت ماوەی ١٥ رۆژ بۆ دابەزینی پاڵە پەستۆی خوێن .

٣٨)-گوڵە سەعات ١٠٠ غم +٥٠٠ غم زەنجەفیل ئەمجا ژەمی یەك کەوچك چا بۆ یەك پەرداخ ئاو دوای کوڵان سێ ژەم بخورێت ٧ رۆژ بۆ زەخت دابەزین .

٣٩)-پەلپینە دو کەوچك +یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت بە ژەمێك ماوەی ١٥ رۆژ بۆ شەکرە و فشاری خوێن باشە .

٤٠)-گوڵاڵە سورە +گەڵا گوێز دوو کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت رۆژی دوو جار بخورێت بۆ شەکرە .

٤١)-سێ پیاڵە ئاوی هەناری ترش + سێ پیاڵە ئاوی شوتی +دوو پیاڵەئاوی گێزەر بۆ ژەمێك سێ ژەم بخورێ ماوەی ١٥ رۆژ بۆ شەکرە

٤٢)–مێوە مارانە ٣٠ غم +هەزبی ٢٠ غم +گوڵە گوڕزوان ١٠٠ غم ئەمجا جاری دوو کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت بۆ ژەمێ ڕۆژی دووجار بۆ ٧ ڕۆژ بۆ دڵە کزێ.

٤٣)–ترشە سماق دوو کەوچك + تۆوی کاهو یەك کەوچك + شملی یەك کەوچك + دوو پەرداخ ئاو بکوڵێت بۆ ژەمێ ڕۆژی دووجار بۆ شەکرە و زەخت .

٤٤)–دۆشاوی توو + ڕەگی چەق چەقە بکوڵێت + یەك لیتر ئاو ڕۆژی سێ پەرداخ بخورێت ماوەی ١٥ ڕۆژ بۆ شەکرە.

٤٥)–شملی +ڕەشکە +گژنیژ یەکی ١٥٠غم ئەمجا ٥٠غم +نیو لتر ئاو بکوڵێت و بخورێت بە ڕۆژێك بۆ شەکرە و زەخت.

٤٦)–شنگ + شملی + ڕەشکە +ڕازیانە لە هەموویان جاری ٥٠ غم + یەك لیتر ئاو بکوڵێت بە دوو جار بخورێت پێش نان ماوەی ٧ ڕۆژ بۆ زەخت .

٤٧)–کەتیرەی زەرد٢٠غم +یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت بە یەك جار بۆ ماوەی ١٥ ڕۆژ بۆ شەکرە.

٤٨)–مۆرە گیا+ تۆڵەکە +نیلوفەر +گەزنە تێکەڵاو بکرێ جاری ٥٠ غم + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت بخورێ ڕۆژی دوو جار ماوەی ١٥ ڕۆژ بۆ شەکرە و زەخت .

٤٩)–٥٠ غم چنور +یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت ماوەی ٧ ڕۆژ بۆ زەخت .

٥٠)–سالمە +زیرە+حێل یەکی ١٠٠ غم ئەمجا یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت بخورێ پێش نان ڕۆژی دوو جار بۆ شەکرە و زەخت .

٥١)–شیلان +گەڵاگوێز +گەڵا گوێزێیەکی٥٠ غم + دوو پەرداخ ئاو بکوڵێت بە دوو جار لە ڕۆژێکدا بخورێت ماوەی ٧ ڕۆژ بۆ زەخت .

٥٢)–گەڵا سورە چنار +گەڵا گوێز +گەڵا گوێز یەك کەوچك +یەك پەرداخ بۆ ژەمێك ڕۆژی دو جار بۆ شەکرە و زەخت.

٥٣)–خەردل سپی +زەنجەفیل یەك کەوچك بە کوترلوی + یەك پەرداخ ئاو بە جارێك بخورێت ڕۆژی دوو جار ماوەی ٧ ڕۆژ بۆ دەست و قاچ لەرزین.

٥٤)–دوو کەوچك لە هاڕلوەی گیا خاوێ +١،٥ لیتر ئاو بکوڵێت بخورێت بۆ نەخۆشی شەکرەو زەخت زۆر باشە .

٥٥)–شملی + سیر یەکی یەك کەوچك +یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت سێ ژەم نەخۆشی شەکرەو زەخت چاك دەکات

٥٦)-زەنجەفیل +دارچینی یەك كەوچك +یەك پەرداخ ئاو دوای كولان بخورێت بۆ شەكرەو زەخت زۆر باشە .

٥٧)-قەیتەران +گەڵا گوێز + نەعنا + گەزنە لە هاڕاوەی هەموویان ٢٠٠ غم ئەمجا یەك پیاڵە + یەك پەرداخ ئاو بكوڵێت سێ ژەم بە ناشتا بخورێت خوێن پاك دەكاتەوە لە چەوری و شەكرە.

٥٨)-ئاوی ماست + سیر ڕۆژی دوو جار بخورێت بۆ لابردنی شەكری ناو خوێن زۆر باشە.

٥٩)-ئاوی گێزەر ڕۆژی دوو پەرداخ بخورێت بۆ لابردنی شەكری ناو خوێن زۆر باشە ماوەی ٤٠ ڕۆژ شەكرە نامێنێ چونكە ئەنسۆلین زۆرە .

٦٠)-ئاوی گێزەر + ئاوی شێلم ڕۆژانەدوو پەرداخ بۆ لابردنی شەكرە چونكە ئەنسۆلینیان زۆر تیایە.

٦١)-ئاردە برنج + گوڵی بەڵاور بۆ ماوەی سێ مانگ ٢٠ ٪ كولسترول دادەبەزێنێ لە پاپان پزیشكێك دۆزیوێتیەوە..

## ئارام بەخش و گرژبوونی دەمارەكان
## ( تصلب الشرايين و المهدات و علاج التشنجات)

١)-ترشە سماق + تۆو كاهو +توە سورە یەكی ٥٠غم + سێ پەرداخ ئاو بە ڕۆژێك بخورێت دوای كولان ٧ ڕۆژلەسەر یەك.

٢)-لۆكە كێویلە + گوێزوان یەك كەوچك +یەك پەرداخ ئاو بخورێت ڕۆژی سێ جار بۆ ئازاری باریكایی پشت و دەمار گرژی.

٣)- گەڵا پەڕەم بە گوڵ و گیاوە ٢٠غم + یەك پەرداخ ئاو بكوڵێت وەك چا بخورێتە بۆ دەمار گرژی.

٤)-لیمۆی ترش سێ ژەم ژەمی یەك پەرداخ ماوەی ٧ ڕۆژ بەردەوام.

٥)-تەماتە مارانە ئەم گیایە بە كوترلوی یەك كەوچك + یەك پەرداخ ئاو بیكوڵێنی سێ ژەم بخورێت بۆ گرژبوونی دەمارو لە ڕزینی پێڵوی چاو.

٦)-تۆو شادانە یەك كەوچك +یەك پەرداخ ئاو بكوڵێت ڕۆژی دوو جار ماوەی ٧ ڕۆژ بۆ تشنج و تصلب.

٧)- ٥٠غم تۆو کەما+ ٥٠ غم سونبل الطیب + یەک لیتر ئاو بکوڵێت بە سێ ژەم لە ڕۆژێکدا بخورێتەوە ٧ ڕۆژ بەردەوام بۆ تشنج ی عەزەلات.

٨)- ٢٠ غم قەیتەران +٢٠ غم زنیان +دوو پەرداخ ئاو بکوڵێت بە سێ ژەم لە ڕۆژێکدا بخورێت ٥ ڕۆژ بەردەوام بۆ تشنجی عەزەلات.

٩)-خردل سپی + زەنجەفیل یەک کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت ماوەی ٧ ڕۆژ دوو جار بۆ دەمار گرژی.

١٠)-هەمزینی+چا کێویلە یەکی ٥٠ غم + یەک لیتر ئاو بکوڵێت بە دووجار هەموی بخورێتەوە لە ڕۆژێکدا ٥ ڕۆژ بەکار بێ بۆ دەمار گرژی.

١١)- ٥٠ غم گیا خاوی یان گیا ئازار +٥٠غم ڕەشکە سێ پەرداخ ئاو بە سێ ژەم بە ڕۆژێک بخورێت ٥ ڕۆژ بۆ تشنج و تصلب دەمار گرژی.

١٢)-گیا خاوێ ٣ کەوچک + ٢ پەرداخ ئاو بکوڵێت و بیخورێ لە ڕۆژێک دا ماوەی ٧ ڕۆژ لەسەر یەک بۆ ئازارو دەمار گرژی.

١٤)- قەیتەران + مەرزە بخۆش جاری دوو کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بۆ ژەمێک ڕۆژی دوو جار بە ناشتا بخورێت ماوەی ٥ ڕۆژ بۆ دەمار گرژی.

١٥)-گوڵە سورە بەهاری ٥٠غم + ڕەشکە ٥٠ غم دوای یەک کەوچک بۆ پەرداخێک ئاو بە سێ ژەم لە ڕۆژێکدا بخورێ ٥ ڕۆژ بۆ تشنجی عەزەلات.

١٦)-بۆژانە یەک کەوچک + یەک پەرداخ ئاو دوای کوڵان ڕۆژی دووجار ٥ ڕۆژ بەردەوام بۆ تشنج.

١٧)-دەرمانە ئازار یان گوڵە دەوری یەک کەوچک + یەک پەرداخ ئاو دوای کوڵان دوو جار ٥ ڕۆژ بۆ تشنج و ئارام بەخش.

١٨)-کۆلیجان + مێخەک + زەنجەفیل جاری دوو کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بۆ ژەمێک ڕۆژی دو جار بە ناشتا بخورێ ماوەی ٥ ڕۆژ بۆ دەمار گرژی.

١٩)-گەڵای بنارێ + گەڵا گوێز + پەیکوڵ لە هاڕاوەی هەردوکیان جاری یەک پیاڵە + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێ ماوەی ٥ ڕۆژ سێ ژەم بۆ دەمار گرژی .

٢٠)گوڵە ئاسۆ یەک کەوچک بۆ سێ پەرداخ ئاو بکوڵێت ژەمی یەک پەرداخ سێ ژەم لە ڕۆژێکدا ٧ ڕۆژ بەردەوام ئارام بەخشە .

٢١)-گەڵای سنەوبەر بکوڵێت وەک دۆشاوی لێ بێت عەزەلاتەکانی پێ چەور بکە بۆ دەمار گرژی و ئازار زۆر باشە.

٢٢)-سیرخواردنی کرژی دەمارەکان نامێڵێ .

٢٣)- گوڵە سورە بەهاری یەك کەوچك چێشت بۆ دوو پەرداخ ئاو بە دوو ژەم لە ڕۆژێکدا ئارام بەخشە .

٢٤)-کلکە ڕێوی +زەنجەفیل یەکی ٥٠ غم دوای یەك کەوچك چێشت بۆ پەرداخێك ئاو دوای کوڵان ڕۆژی دووجار ٥ڕۆژ ئارام بەخشە.

٢٥)-زەنجەفیل +حیل یەك کەوچك بۆ یەك پەرداخ ئاو دوای کوڵان ڕۆژی دوو ژەم ٧ ڕۆژ بەردەوام ئارام بەخشە .

٢٦)-گیا گوڵە گەنم ٢ کەوچك + یەك پەرداخ ئاو دوای کوڵان سێ ژەم ١٠ ڕۆژ بەردەوام ئارام بەخشە.

٢٧)-تەرخون یەك کەوچك +یەك پەرداخ ئاو دوای کوڵان ڕۆژی دوو جار ١٠ ڕۆژ بەردەوام ئارام بەخشە.

٢٨)-تۆتەڕی مەرگە مار ١٠غم +یەك پەرداخ ئاو دوای کوڵان ڕۆژی دووجار ٧ ڕۆژ بەردەوام ئارام بەخشە .

٢٩)-١٠٠ غم گەڵا گوێز + یەك پەرداخ ئاو دوای کوڵان بخورێت ڕۆژی ٣ جار ١٥ ڕۆژ بەردەوام ئارام بەخشە .

٣٠)-گوڵە شەرمین یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بخورێت ڕۆژی سێ جار ١٠ ڕۆژ بەردەوام ئارام بەخشە .

٣١)-یەك کەوچك قاوە + یەك پەرداخ ئاو دوای کوڵان بخورێت سێ ژەم ١٥ ڕۆژ بەردەوام ئارام بەخشە.

٣٢)-٢٠ غم مێخەك +٢٠ غم گوڵە گوڕوان + یەك پەرداخ ئاو دوای کوڵان بخورێت سێ ژەم ٧ ڕۆژ ئارام بەخشە .

٣٣)-یەك کەوچك کاسە گول + یەك پەرداخ ئاو دوای کوڵان بخورێت سێ ژەم ٥ ڕۆژ ئارام بەخشە .

# دەمار وەرگەڕان

١)-ئالەت + مێخەك + بیبەر + زەنجەفیل + دارچینی + گوێز بە ئەندازەی یەك بیان كوتە و لە حەمامێكدا گیانی پێ چەور بكرێ بۆ إنزلاق .

٢)-زەنجەفیل یەك كەوچك + هەنگوین یەك كەوچك بۆ ژەمێك بخورێت سێ ژەم دوای حەمام كردنەكە بۆ إنزلاق و دەمار وەرگەڕان دەمار كرژی باشە بخورێ وەك چا .

٣)-قاقلی + بەیبون +گژنیژ + هەزبێ یەکی ١٠٠غم ٢ لیتر ئاو دوای كوڵان سێ ژەم بخورێت جاری یەكە پیاڵە ١٠ ڕۆژ بەردەوام ئارام بەخشە.

٤)-كەرتەشی +ڕازیانە یەك كەوچك + یەك پەرداخ ئاو بكوڵێت و بخورێت وسێ ژەم بۆ ماوە ٧ ڕۆژ ئارام بەخشە .

٥)-گوڵە عەم یەك كەوچك +یەك پەرداخ ئاو دوای كوڵان بخورێت سێ ژەم ماوەی ١٥ڕۆژ ئارلم بەخش.

٦)-گوڵە با بۆق كوژ + ڕەگی بەڵەك +هەزبێ +دوو كەوچك + یەك پەرداخ ئاو دوای كوڵان بخورێت ڕۆژی سێ جار ماوەی ١٥ ڕۆژ ئارام بەخشە.

٧)-سعلْ یەك كەوچك + یەك پەرداخ شیر سێ ژەم ماوەی ١٠ ڕۆژ ئارلم بەخشە.

٨)-گوڵە سوسن + ڕازیانە یەك كەوچك +یەك پەرداخ ئاو دوای كوڵان سێ ژەم ماوەی ٧ ڕۆژ ئارلم بەخشە.

٩)-فاطمە باخی + پونگە +وەنەوشە دوو كەوچك + یەك پەرداخ ئاو دوای كوڵان سێ ژەم ماوەی ١٥ ڕۆژ ئارام بەخشە .

١٠)-گوڵە خەو +بەیبون +گوێزوان +مەرز نجۆش دوو كەوچك +یەك پەرداخ ئاو دوای كوڵان بخورێت سێ ژەم ١٥ ڕۆژ ئارلم بەخشە .

١١)-گوڵە سەعات +زەنجەفیل یەك كەوچك چا بۆ یەك پەرداخ ئاو ڕۆژی سێ جار دوای كوڵان ٧ ڕۆژ بەردەوام ئارلم بەخشە .

١٢)-گوڵە خشخاش +شقائق +گوێزوان +وەنەوشە یەك كەوچك + یەك پەرداخ ئاو بكوڵێت ڕۆژی سێ جار ماوەی ١٠ ڕۆژ ئارام بەخشە

١٤)-مەرزە نجۆش +گوڵە خەو یەكی ٢٠٠غم +یەك غم زەعفەران دوو كەوچك + یەك پەرداخ ئاو بكوڵێت سێ ژەم بخورێت ماوەی ٧ ڕۆژ ئارام بەخشە .

## نەخۆشیەکانی دڵ و تصفیەی خوێن

١)-یەک پیاڵە عارەقی بی + ئاوی سێو یەک پەرداخ بۆ ژەمێک دوو جار بخورێت دڵ بەهێز دەکات.

٢)-یەک پیاڵە گوڵاوی گیراوە + ئاوی سێو یەک پەرداخ + دو کەوچک هەنگوین بۆ ژەمێک رۆژی دوو جار بخورێت ماوەی ١٠ رۆژ بۆ دڵ ئێشە.

٣)-گوڵی چنور یەک کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت بە ژەمێک رۆژی سێ جار بۆ بێ هێزی دڵ باشە بەهێزی دەکا.

٤)-پێشوکە (زەعفەرانی کێوی) بۆ بەهێز کردنی دڵ باشە بۆ دەست و قاچ سڕبون باشە خواردنی گوڵەکەی باشترە.

٥)-گوڵ و گیای خاوێ یەک کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت بۆ ژەمێک رۆژی سێ جار چارەی بێ هێزی دڵ دەکات.

٦)-قەیتەران + گەزنە + گەڵا گزێژ + نەعنا لە هەمو ٣٠٠ غم جاری یەک پیاڵە + دوو پەرداخ ئاو بکوڵێت بخورێت رۆژی سێ جار بە ناشتا بۆ پاکردنەوەی خوێن.

٧)-شیلان + گەڵا گزێژ + گەڵا گوێز جاری یەک پیاڵە + دوو پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت رۆژی سێ جار بۆ پاکردنەوەی خوێن.

٨)-کولیجان + دارچینی + زەنجەفیل یەک کەوچک + یەک پەرجاخ ئاو بکوڵێت و بخورێت بۆ لابردنی چەوری ئاوسک و دەمارەکان.

٩)-گوڵ و گیای خاوێ یەک کەوچک یەک پەرداخ ئاو بکوڵێ بخورێ سێ جار لە رۆژێکدا بۆ تصفیەی خوێن.

١٠)-ئاردە برنج یەک کەوچک + یەک پەرداخ ترشە سماق + یەک پەرداخ ئاو رۆژی دوو جار بخورێت ماوەی ١٥ رۆژ بۆ لابردنی برینی چەوری و پاکردنەوەی خوێن.

١١)-سیر + سرکە + رەشکە بە ئەندازەی بخورێت بۆ پاکردنەوەی خوێن.

١٢)-سیر + ترش + لیمۆ + هەنار + نارنج بۆ پاکردنەوەی خوێن لە چەوری و رمڵ.

١٣)-گەڵای بناوێ + قەیتران + پیکوڵ + هەرێز ٥٠ غم + یەک لیتر ئاو بکوڵێ بخورێتەوە رۆژی ٣ جار بۆ سێ رۆژ تصفیەی خوێن.

١٤)-زەنجەفیل + دارچینی یەک کەوچک + یەک پەرداخ ئاو ٧ رۆژ بۆ تصفیەی خوێن .

١٥)–ئاوی ئاڵتون بۆبەهێزبونی دڵ:کانزایەکی ئاڵتون بتوێننەوە لەناو ئاوەکەدلو ئەمجا ئاوەکەی بخورێتەوە بۆ٣ژەم بۆ بە هێزی دڵ.

١٦)–عەرەقی بی ژەمی ١پەرداخ بخورێت ٣ژەم ٧رۆژ بەردەوام.

١٧)–گیا خاوێن ١کەوچك +١پەرداخ ئاوبکوڵێت و بخورێ بۆ جڵدەباشە.

١٨)–گوڵی گوێزوان + سنبل الطیب +نبات یەکی مسقاڵێك + پەرداخ ئاو بە یەك ژەم بیخوات ٠ ١رۆژ بەردەوام دڵ بە هێز دەکات.

١٩)–شنگ ئەم گیا لەگەڵ هێلکە بکرێت بە شفتە بۆ ئازاری دڵ زۆر باشە بۆ ماوەی ٧ رۆژ بەردەوام،بە یانیان بە ناشتا یەك پەرداخ ئاوی سارد بخورێتەوە بۆ ماوەی ١٤ رۆژ بۆ ئازاری دڵ و بەهێز بوونی.

٢٠)–عەرەقی رازیانە +عەرەقی شمڵی +عەرەقی رەشکە رۆژی دو جار جاری یەك پیاڵە ٧ رۆژ بەردەوام بۆ ئازاری دڵ و بەهێز بوونی.

٢١)–٢٥٠غم رەشکە +١کغم هەنگوین رۆژی٢ژەم ژەمی ٢کەوچك پێش خواردن ٤٠ رۆژ بەردەوام بۆنەخۆشیی دڵ.

٢٢)–٢کەوچك رەگ و سەلکی سەبر +٢کەوچك جۆ +١پەرداخ ئاو دوایکوڵاندن بخورێت ٣رۆژ ٣ ژەمە بەردەوام بۆجڵدە و شەلەل.

٢٣)–کلکە رێوی + زەنجەفیل ٢ کەوچك لە هەردوکیان + ١ پەرداخ ئاو دوای کوڵاندن ٢ ژەم ٧ رۆژ بخورێت بۆدڵە لەرزە ترس.

٢٤)–تەرخون جاری ١ کەوچك +١پەرداخ ئاو دوا یکوڵا ندن ٢جار لەرۆژێك دا یان بەکاڵی بخورێت چەند رۆژێك.

٢٥)–لیمۆی شیرین رۆژی٢جار جاری ١ پەرداخ لەئاوەکەی بخورێت ١٠ رۆژ بۆدڵە لەرزە دڵەکوتێ و پەلە پەل.

٢٦)–قاوە ٢ ژەم ژەمی ١٠ غم + پەرداخێك ئاو وەك چا بخورێت ١٠ رۆژ بۆ دڵە لەرزە و دڵە کوتێ،دڵە راوکێ.

٢٧)–تۆوی تەڕ بی یەك کەوچك + دوو پەرداخ ئاو +یەك مسقاڵ نبات یان یەك کەوچك شەکر بەیەك جار بخورێت دوای کوڵان ٢ژەم ٥ رۆژ.

٢٨)–١٥٠غم گەڵای بناوەج +١٠٠غم گەڵا گویژ +٢لترئاو دوای کوڵان ٢ژەم ژەمی پەرداخێك پێش نان ٧رۆژ بۆ دڵە کوتێ و بەهێزکردن.

٢٩)–لیمۆی ترش + ترێ + هەنار + شاتو + سیر ٥ پەرداخ ئاوی ئەم میوانە سێ ژەم بخورێت بۆ ماوەی ٣٠ رۆژ(پۆسکتە جلدە)بۆ مانگێك.

٣٠)–٥ لیمۆی ترش +یەك كەوچك ترشە سماق + یەك كەوچك تۆو كاهو +یەك كەوچك شاتو + یەك لیتر ئاو ١٠ دەقیقە بكوڵێت رۆژی سێ جار بۆ مانگێك بۆ جلدە.

٣١)–خواردنی بەڕوە سپی و گەڵای بۆ ماوەیەك زۆر باشە بۆ بەرگری لە(جلدە و شلل) .

٣٢)–تۆوی مێو مارانە ١٠دەنك +دوو كەوچك هەزبی +یەك پەرداخ ئاو دوای كوڵان بخورێت چەند جارێك بۆ دەست لەرزین.

٣٣)–علی بابا +گوێز +بادەم +هەنگوین یەك كفم ژەمی دوو كەوچك بۆ دەست لەرزین كە لە بێ هێزی یەوە بێ بەڵام نابێ زەختی هەبێ وە ئاو لیمۆ بدرێتێ.

٣٤)–قاقلی بهارە یان شماڵ گیر +بەیبون + هەزبی +گەژنیژ یەكی ١٠٠ غم بۆ دوو لیتر ئاو بكوڵێت رۆژی سێ جار جاری یەك پیاڵە ١٠رۆژ بۆ پاكردنەوە خوێن.

٣٥)–سمڵ یەك كەوچك + یەك پەرداخ شیر بەیانیان بە ناشتا بۆ پاكردنەوەی خوێن.

٣٦)–تۆو كاهو +كەرەوز یەكی ١٠٠ غم بۆ لیتر ئاو دوای كوڵان سێ ژەم ژەمی دو پەرداخ بۆ ١٠ رۆژ بۆ پاككردنەوەی خوێن.

٣٧)–تۆڵەكە +گەڵا گزیژ +گوڵە گوێزوان+گوڵە وەنوشە دوو كەوچك بۆ یەك پەرداخ بۆ ژەمێك رۆژی دوو جار ماوەی ٧ رۆژ بۆ پاككردنەوەی خوێن.

٣٨)–عارەقی نەعنا یان پونگە سێ ژەم ژەمی یەك پیاڵە ١٥ رۆژ بەردەوام بۆ پاكردنەوەی خوێن.

٣٩)–كوزەڵە +ڕەشكە هەردوكیان یەك كەوچك بۆ یەك پەرداخ ئاو بكوڵێت رۆژی دوو جار ٧ رۆژ بۆ پاكردنەوەی خوێن.

٤٠)–ڕێحانە + گوڵە وەنەوشە یەكی ١٥٠ غم ئەمجا یەك كەوچك بۆ یەك پەرداخ ئاو دوای كوڵان سێ ژەم ٧ رۆژ بۆ پاكردنەوەی خوێن .

٤١)–ترشە سماق ژەمی دوو كەوچك بۆ یەك پەرداخی ئاو دوای كوڵان رۆژی دوو ژەم ٧ رۆژ بەردەوام بۆ پاكردنەوەی خوێن .

٤٢)–خواردنی خورما و ماش بە ناشتا خوێن پاك دەكاتەوە خواردنی ئاوی خەیار بە ناشتا خواردنی ئاوی كولەكە بە ناشتا خوێن پاك دەكاتەوە .

٤٣)–لیمۆی ترش + شاتو +هەنار +سیر +ترێ +یەك لیتر ئاوی ئەم میوانە لە رۆژێكدا بخورێت ٧ رۆژ خوێن پاك دەبێتەوە .

٤٤)-بەڕوە سپی خواردنی خوێن پاك دەكاتەوە،خواردنی ئاوی نارنج خوێن پاك دەكاتەوە،یەك مسقال زەعفەران خوێن پاك دەكاتەوە.

٤٥)-شادانە +كەما یەك كەوچك بۆ یەك پەرداخ ئاو دوای كوڵان ڕۆژی دوو جار ٥ ڕۆژ بەردەوام بۆ پاكردنەوەی خوێن .

٤٦)-تۆوە شێلم +شاتەرە +چەقە چەقەیەكی ١٠٠ غم یەك كەوچك بۆ دوو پەرداخ ئاو بكوڵێت بە دوو ژەم لە ڕۆژێكدا ٥ ڕۆژ بەردەوام بۆ پاكردنەوەی خوێن .

٤٧)-هەرزن + پەیگوڵ +ڕەشكە یەكی ١٠٠ غم دوای یەك كەوچك + یەك پەرداخ ئاو ڕۆژی دوو جار دوای كوڵان ٥ ڕۆژ بۆ پاكردنەوەی خوێن .

٤٨)-پیچە (نەرمیلی) بە كوڵاوی وەك چا بخورێ دڵ بەهێز دەكات مرۆڤ ئازا دەكات و دەرزی لێ دروست نەكەن بۆ بەهێزی .

## خوێن بەربون خوێن ڕێژەی دەرەوە و ناوەوە (هەناو)
## النزیف الداخلی و الخارجی

١)-قارچك +لۆو گژنیژ +زیرە یەكی ٥٠ غم بكوڵێت و بخورێتەوە ماوەی ٥ ڕۆژ بۆ نزیفی داخلی و خوێن ڕێژی هەناو.

٢)-توێكڵی سێوی شیرین +گەڵا بەهێ یەكی ٥٠ غم + دوو پەرداخ ئاو بكوڵێت بە دوو جار بخورێت بۆ خوێن ڕێژی هەناو.

٣)-گەڵا بەهێ +گەڵا بەڕو +گەڵا بی تێكەڵاو بكرێ یەك كەوچك بۆ یەك پەرداخ ئاو بكوڵێت ڕۆژی دوو جار بۆ خوێن ڕێژی هەناو.

٤)-توێكڵە ناسكەكەی ژێر توێكڵە ڕەقەكەی بەڕو ژەمی یەك كەوچك + یەك پەرداخ ئاو بكوڵێت بۆ خوێن ڕێژی هەناو.

٥)-گیای شینە زەمق گوڵە كەی،مۆرە گوڵ و ڕەگ و پەل + بەڕو +ماست ژەمی یەك پیاڵە بخورێت بۆ خوێن ڕێژا هەناو.

٦)-مۆرد +گەڵا بەڕو + مازو یەكی ١٠٠ غم ئەم جا یەك كەوچك +یەك پەرداخ ئاو بكوڵێت بۆ خوێن ڕێژا هەناو.

٧)-ڕەشكە + تۆوی شوێت+تۆوی گژنیژ یەكی ١٠٠غم ئەمجا یەك كەوچك + دوو پەرداخ ئاو بكوڵێت بۆ خوێن ڕێژی هەناو.

٨)-قنگرە کەرانە ١٠٠ غم لەگوڵی گیاکە + یەك لیتر ئاو دوای کوڵان سێ ژەم ژەمی دوو پەرداخ بخورێت ٧ ڕۆژ بۆ خوێن ڕێژی هەناو.

٩)-ماش ژەمی ٥٠ غم بکوڵێت و بخورێت و بۆ خوێن ڕێژی هەناو.

١٠)-کولەکە کێوی + گوڵە ماهور +چەق چەقە یەکی ١٠٠ غم ئەمجا یەك کەوچك بۆ یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت ڕۆژی سێ جار سێ ڕۆژ بەردەوام نەزیفی عادەی ژنان رادەگرێ.

١١)-زەردێنەی هێلکە + عارەقی گوڵە تریانتێن بد ڕێ لە برینی دەرەوە خوێن ڕێژە نامێنێ واتە بۆ خوێن بەستن .

١٢)-بەڕو بە توێکڵەوە + توێکڵی گوێز بهاڕێتەوە بکرێت بۆبرینیدەرەوە بۆ خوێن بەستن .

١٣)-گەڵای قومام +گەڵای گوێز دوای هاڕینەوە والا بێژ بکرێت بۆ برینی بڕاوی دەرەوە و خوێن بەست.

١٤)-بەڕ وە سپی و گەڵاکەی بکوڵێت ٥٠ غم بۆ پەرداخێك ڕۆژی دوو جار بخورێت و بۆ خوێن ڕێژی ژنان و هەناو باشە.

١٥)-گەڵا سێو +گەڵا بەڕ و یەکی ١٠٠ غم + دوو پەرداخ ئاو بکوڵێت بە دوو جار بخورێت بۆ خوێن ڕێژی گەدەو هەناو.

١٦)-توێکڵی هەنار + گەڵای بەڕ و بە کوترلوی یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت بۆ خوێن ڕێژی گەدەو میزەڵدان.

١٧)-گوڵە هێرۆ + گوڵە بەیبون بەئەندازە دوای کوڵان خۆی پێ بشوات کە شلەتێن بوو ئاو ماڵی ژنی پێ بشوات سێ ژەم ماوەی ١٥ ڕۆژ بۆ خوێن ڕێژی منداڵدان.

١٨)-مازو شین + توێکڵە تەنکەکەی بەڕو دوای توێکڵە رەقەکەکە دێت تاڵە بهاڕێت و بکرێ بە لفاف کەشیلەی هەنگوینی پێوە بێ وەك شاف بۆ ماوەی دوو سەعات بۆ ڕەحم بۆ نەزیف و إلتهاب.

١٩)-ترشە سماق دوو کەوچك + یەك کەوچك بەیبون دوای کوڵان بخورێت ڕۆژی دووجار تا چاك دەبێت بۆ خوێن ڕێژی ژنان و هەو کردنی منداڵدان.

٢٠)-هەوزن ئاردەکەی + دۆشاوی ترێ + ڕۆنی زەیتون یان ڕۆنی بادەم بکرێ بە حەڵوا بۆ خوێن ڕێژی منداڵدان زۆر باشە.

٢١)-شەلی یەك پیاڵە + یەك پەرداخ ئاو دوای کوڵان بە ناشتا بخورێت ماوەی ٧ ڕۆژ ڕۆژی یەك جار چارەسەری هەمیشەیی خوێن ڕێژی ژنان دەکات ..

٢٢)-مازو + گوڵە هەنار + گوڵی نەرمەنی بکوترێت + رۆنی زەیتون + لەفاف بکرێ بە شاف شەوی یەک شاف بەخۆ هەڵگری ماوەی ٦ شەو نەزیفی ژنان چارەسەر دەکات .

## نەخۆشیەکانی کۆئەندامی هەناسە، سیل و رەبۆ

١)-رەگ یان گوڵی چنور ١٠٠ غم + تۆوی ڕکێشە ١٠٠ غم + یەک کفم هەنگوین رۆژی سێ جار جاری یەک کەوچک بخوات پێش نان بۆ إلتهاباتی سنگ.

٢)-گوڵە سورە + زوفا + گوڵە گوێزوان یەکی ٥٠غم ئەمجا یەک کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت بە ژەمێ بخورێ رۆژی دوو جار ٧ رۆژ بەردەوام بۆ ڕەبو.

٣)-٣٠٠ غم گوڵە باغ + هەنگوین یەک کفم جاری دوو کەوچک پێش نان بخورێ بەیانیان و ئێواران بۆسیل.

٤)-گوڵی گوێ بەرخە + گەڵا گەزنە + گوڵی ماهور + ڕازیانە یەکی ٥٠ غم ئەمجا یەک کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێ رۆژی سێ جار بۆ إلتهاباتی سنگ.

٥)-سیر ٣٠٠ غم + پیاز ٣٠٠غم ئاوەکەی بگیرێ + سێ سم[٢] ئاوی سرکە بخرێتە ناو شوشە و سەری بگیرێ بۆ ماوەی ٥ رۆژ ئەمجا جاری یەک کەوچک سێ ژەم بخورێت بۆ ماوەی ٤٠ رۆژ ڕەبو چاک دەبێ.

٦)-تریاک بە سوتاوی + بەزی بزن بە کوترلوی گەرم بکرێت و وەک مەلهەم سنگی پێ چەور بکرێت بۆ تەنگە نەفەسی.

٧)-هەزبێ + بەیبون + ڕەگی پونگە + قەیتەران بە کوترلوی جاری یەک کەوچک + دوو پیاڵە ئاو بکوڵێت +[١] کەوچک هەنگوین پێش نان بخورێ سێ جار ماوەی یەک مانگ بۆ ڕەبو.

٨)-عەرەقی نەعنا + عەرەقی هەزبی + عەرەقی پونگە جاری نیو پاڵە لە عارەقی هەمویان رۆژی سێ جار بۆ ماوەی ٢٠ رۆژ بخورێت بۆ ڕەبو.

٩)-میوەی درەختی دارسنجو (سرنچکە)+ شیلان + وەنەوشە + گەزنە یەک پیاڵە + دوو پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت رۆژی جارێک بۆ ڕەبو هەوکردنی سیەکان.

١٠)-گوڵە خەیار + گوڵی وەنەوشە + گوڵە باخ یەکی ١٠٠ غم + یەک کفم هەنگوین سێ ژەم ژەمی یەک کەوچک بخۆن بۆ ماوەی یەک مانگ بۆ سیل باشە.

١١)-بۆ کۆکەی ووشك شیرگ خوشتر بەیانیان یەك پەرداخ بخورێت ماوەی ٥-٧ رۆژ چاك دەبێ.

١٢)-بۆ کۆکەی ووشك و تەنگەنەفەسی رۆژی یەك پیاڵە شیری ئافرەتێك کچی بە بەرموەبێت بخورێت ماوەی ٧ رۆژ چاك دەبێ.

١٣)-هەنجیر دیمی ١٠دانە + یەك پەرداخ شیرە بزن مەرمزە شەو تیایا بێت بەیانیان بخورێت ماوەی ١٠ رۆژ بۆ هەناسە توندی و سنگ ئێشە.

١٤)-هەزبی + ڕازیانە + گەزنە + گوڵە پونگە یەکی ١٠٠ غم ئەمجا دو کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت بخورێت ماوەی ١٥ رۆژ رۆژی سێ جار بۆ زات الرئەوهەو کردنی سی.

١٥)-ئاوکی هەڵوژەبە سوتاوی بکوترێ + رۆن زەیتون بکرێ بە مەڵهەم سنگی پشتی پێ چەور بکرێت بۆ ئازاری سنگ و خیزە خیزی سنگ.

١٦)-رۆنی بەیبون ژەمی یەك کەوچك بخورێ دوای خواردن ، رۆنی بەیبون(دروست کردنی ئەبێت بەیبون بکوڵێت دوای بیپاڵێوی ئەمجا یەك لیتر لەو دۆشاوە بەیبونە سێ پیاڵە رۆنی زەیتونی تێ ئەکەین و دیسان دەیکوڵێنین تا خەست دەبێت و دەبێ بە رۆنی بەیبون).

١٧)-کەتیرەی سپی + رازیانە + گژنیژ یەکی ١٠٠غم دوای یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بۆ جارێك رۆژی سێ جار بخورێت بۆ ڕەبۆ و تەنگەنەفەسی.

١٨)-هاز +شقائق یەکی ١٠٠ غم + چوار پەرداخ ئاو بکوڵێت بە ٤ ژەم بخورێت ماوەی ١٥ رۆژ بەکار بێت بۆ ڕەبۆ و تەنگەنەفەسی و سیل.

١٩)-گوڵە مێرۆ + گوڵە وەنەوشە + قەیتەران لە هەمویان رۆژی ١٠٠غم + ٣ پەرداخ ئاو ٣ ژەم بخورێت ٧ رۆژ بەردەوام بۆ کۆکەوسنگ ئێشەوهەناسە توندی.

٢٠)-خواردنی شێلم بۆ هەناسە توندیوکۆکە زۆر باشەوبۆ ئازاری سنگ لەگەڵ چەنەوەر و گوڵە مێرۆ.

٢١)-رێحانە کێویلە + زوفا + وەنەوشە + گوڵزروان +قەیتەران یەکی ١٠٠ غم دوای یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو دوای کوڵان سێ رۆژ بۆ هەناسە توندی.

٢٢)-زیرە یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت بۆ سنگ ئێشەودەمار گرژی کۆڵنج.

٢٣)-توۆی شادانە جاری یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت بۆ سنگ ئێشەو دەمار گرژی کۆڵنج.

٢٤)-بیبەری تون +سیر یەکی ١٠ غم بکوڵێت و بخورێت بۆ سەرما بوون و سنگ ئێشە و دەمار گرژی و کۆڵنج.

٢٥)-پیازە گوڵانە ڕەگەکەی + زەنجەفیل+ مقل ئزرق یەکی ١٠ غم + سێ پەرداخ ئاو بە سێ ژەم بخورێت بۆ سنگ ئێشەو دەمار گرژی.

٢٦)-گوڵە لاولاو ١٠ غم + ٢٠ غم گوڵی پونگە + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت بە ژەمێک بخورێت بۆ هەناسە توندی.

٢٧)-مێخەک ٢٠ غم +یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت بۆ ژەمێک بخورێت بۆ سنگ ئێشەو دەمار گرژی و کۆڵنج.

٢٨)-٥٠ غم لە کای زەرد + سێ پەرداخ ئاو دوای کوڵان لە ڕۆژێکدا بخورێتەوە بۆ سنگ ئێشە و دەمار گرژی کۆڵنج.

٢٩)-٥٠ غم کالیتوس + سێ پەرداخ ئاو بکوڵێت و بە سێ ژەم بخورێت بۆ هەناسە توندی و لوت گیران زۆر باشە

٣٠)-گوڵە قەناوڵێ + ڕۆنی زەیتون دابنێین لە ئاویا بۆ ماوەی یەک مانگ دەبێ بە قەترە بۆ جیوب جاری یەک قەترە بۆ لوت گیران.

٣١)-شەکر ٧٥٠غم +گوڵە باغ ٢٥٠ غم بیبیژەرەوە + یەک بتڵ گوڵاو + ٥ کەوچک ڕۆن زەیتون بە هێواشی بکوڵێت تا خەست ئەبێتەوە و ئەمجا ڕۆژی سێ جار جاری دوو کەوچک چێشتخۆری بخوات ئەمجا یەک کەوچک بی + دوو کەوچک ڕەشکە + ٥ لیمۆ بکوڵێت + یەک پەرداخ ئاو ڕۆژی سێ جار بۆ سیل.

٣٢)-ئاوی کێزەر،ڕۆژی دوو پەرداخ شەربەتی کێزەر بە ناشتا ماوەی ٤٠ ڕۆژ بخورێت بۆ سیل.

٣٣)-بەهەنی گەیشتو بیپێشینیت ڕۆژی دوو دانە ٤٠ ڕۆژ

٣٤)-تۆو تاوگ +کاکڵە گوێز +هەنگوین یەکی ٢٠٠غم بەیانیان و ئێواران جاری دوو کەوچک پێش نان بخورێت بۆ دەردەسی(ذات الرئة) .

٣٥)-هاز +شقائق یەکی ١٠٠غم بۆ ٤ پەرداخ ئاو بە ڕۆژێک بخورێت ماوەی ١٥ ڕۆژ بۆ سیل.

٣٦)-ڕۆ فا (گیا پرژێن)+وەنەوشە +گوڵە مێرز شقائق یەکی ٥٠ غم ئەمجا یەک کەوچک بۆ یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت ڕۆژی سێ ژەم ١٥ ڕۆژ بۆ تەنگەنەفەسی و کۆکە.

٣٧)-گوڵە با +بەلەك +هەزبی یەکی ٥٠ غم دوای ٢ کەوچك + پەرداخێك ئاو بکوڵێت بۆ ژەمێك رۆژی سێ جار ١٥ رۆژ بۆ تەنگەنەفەسی و سیل.

٣٨)-گوڵی یاسەمەن +گەڵا هەرمێ +جەوتی بەڕو +کاکڵە گوێز یەکی ١٠٠ غم + یەك کفم هەنگوین ژەمی دوو کەوچك پێش نان بۆ سیل و کۆکەڕەشە و دەمار کرژی سنگ.

٣٩)-تۆڵەکە بۆ تەنگەنەفەسی و ڕەبو،کوزەڵە بۆ تەنگەنەفەسی و کۆکە و ئازاری سنگ.

٤٠)-٥٠غم گەڵا گوێز + دوو پەرداخ ئاو بکوڵێت بە دوو ژەم لە رۆژێکدا بخورێت بۆ سیل

٤١)-تۆوی گیا رکێشە دوو کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت بۆ ژەمێك رۆژی دوو ژەم بخورێت ماوەی ٧ رۆژ بۆ إلتهاباتی (هەوکردنی) سنگ.

٤٢)-عەرەقەی نەعنا +پونگە +هەزبی +بەیبون +رازیانە +گژنیژ لە هەمویان ژەمی یەك پیاڵە بۆ بەیانی و ئێوارە ٧ رۆژ بۆ سیل و تەنگەنەفەسی و کۆکە.

٤٣)-کوزەڵە + کەرەوز +تەرە تیزە یەکی ٥٠ غم ئەمجا دوو کەوچك بۆ یەك پەرداخ ئاو بۆ ژەمێك رۆژی دوو ژەم بۆ تەنگەنەفەسی و ئازاری سنگ.

٤٤)-رێحانە دوو کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت بە ژەمێك بخورێت رۆژی دوو ژەم ٧ رۆژ بۆ تەنگەنەفەسی.

## نەخۆشیەکانی مێشک و دەروون ئارامی مێشک (أعصاب)

١)-گیای گوڵە گەنم (قنطورین)ڕۆژی سێ جار جاری دوو کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت بۆ ئارامی.

٢)-گوڵە ئاوات (میمون)+ گوڵە گوڵزەوان لە هەردوکیان یەک کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت بۆ هێور کردنەوەی شێتی.

٣)-گوڵە گوڵزەوان (سنبل الطیب)یەکی ٣٠ غم بەیەک جار + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت بۆ سێ ڕۆژ بەردەوام بۆ هێور کردنەوەی شێتی.

٤)-٢٠٠غم قاقڵی فەلاحەت + یەک لیتر ئاو دوای کوڵاندن جاری یەک پیاڵە بخوات ٣ژەم بۆ ئارامی ئەعصاب ١٠ڕۆژ.

٥)-گوڵە شەرمینی ١کەوچک + ١ پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت بۆ جارێک ڕۆژیی ٣ جار بۆ ئارامی ئەعصاب ١٠ ڕۆژ.

٦)-گەڵا گوێز ٢٠٠غم+ ١لیتر ئاو بە٢ ڕۆژ بخورێت بە ٢ جار ڕۆژی لیترێک بۆ ئارامی ئەعصاب .

٧)-دارچینی ١٠غم +یەک پەرداخ ئاوی کوڵاو بخورێت بە ژەمێک ڕۆژی سێ جار بۆ ئارامی (ئەعصاب)٧ ڕۆژ .

٨)-تۆو شادانە + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت ١٠ ڕۆژ بۆ ئازاری دەمارە هەستیارەکانی مێشک(ئەعصاب).

٩)-گژنیژ دوو کەوچک + یەک پەرداخ ئاو ڕۆژی دوو جار یانی ٤ کەوچک بۆ ڕۆژێ بۆ ئەعصاب ١٥ ڕۆژ بۆ ئارامی(ئەعصاب).

١٠)-گژنیژ +هەزبی +گوڵزەوان لەهەموویان یەک کەوچک بۆ یەک پەرداخ بۆ ژەمێ سێ ژەم بخورێت ١٠ ڕۆژ بۆ ئارامی ئەعصاب .

١١)-چرۆی نارنج ملوی یە بۆ ئەعصاب یەک کەوچک شکۆفە (چرۆ)+ سێ پەرداخ ئاو بکوڵێت بە ڕۆژێک بە سێ ژەم بخورێت.

١٢)-زەعفران یەک کەوچک + یەک پەرداخ ئاوی گەرم بۆ ژەمێک ٥ ڕۆژ بۆ ئارامی ئەعصاب .

١٣)مێخەک ٢٠ غم + ٢٠ غم گوڵزەوان +یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت و بە جارێک بخورێت ٧ ڕۆژ بۆ ئارامی ئەعصاب .

١٤)-کەما زەرد +سنبل الطیب یەکی ٥٠ غم + یەك لیتر ئاو بکوڵێت بە سێ جار لە ڕۆژێکدا بخورێت ١٠ ڕۆژ بۆ ئارامی ئەعصاب .

١٥)-ڕەگی گێزەرە دێمی +هەزبی یەکی ١٠٠ غم +٥٠٠٠ غم هەنگوین ڕۆژی دو جار بخورێت جاری دوو کەوچك بۆ بەریەشان حاڵی ئەعصاب .

١٦)-گوڵ و و ڕەگی کەرتەش + ڕازیانە لە هەردوکیان یەك کەوچك +یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت ڕۆژی سێ جار ٧ ڕۆژ بۆ ئارامی ئەعصاب .

١٧)-گوڵەعەم یەك کەوچك لەگەڵ چا بخورێت ڕۆژی سێ جار بۆ ماوەی ١٥ ڕۆژ بۆ ئارامی ئەعصاب .

١٨)-گوڵە با (بۆق کوژ) + بەڵەك ڕەگەکەی + هەزبی لە هەموی دوو کەوچك + یەك پەرداخ ئاو ڕۆژی سێ جار بۆ ١٥ ڕۆژ بۆ ئارامی ئەعصاب .

١٩)-سمل +زەنجەفیل +وەنەوشە +تۆوە بناوێ لە هەموی دوو کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت بۆ جاری ڕۆژی دوو جار بۆ ١٥ ڕۆژ بۆ ئارامی ئەعصاب .

٢٠)-خەرپەنگ (کەر کوژە)+ عاقر قرحا یەکی یەك مسقال +١٠٠٠غم هەنگوین جاری دوو کەوچك بخورێت بۆ فێ‌وسرع و شێت .

٢١)-کوڵە سوسن +ڕازیانە لە هەردوکیان یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو ڕۆژی سێ جار بۆ نەولنەی دائم غەمبارێ و توڕەن .

٢٢)-دار خەڵات (ڕەشە دەرمان) +گوڵە گوزروان + گوڵە ماهور یەك کەوچك +یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت بخورێت بۆ ئازاری ئەعصاب و سەرئێشە .

٢٣)-فاتمە باخی گەلا و گوڵی +پونگە +وەنەوشە دوو کەوچك +یەگ پەرداخ ئاو بکوڵێت ١٥ ڕۆژ سێ ژەم بۆ ئارامی ئەعصاب .

٢٤)-ڕوحی نەعنا ژەمی یەك پیاڵە بۆ ئارامی ئەعصاب .

٢٥)-گوڵە خەو + گوزروان +بەیبون +مرز نجوش دوو کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت ١٠ ڕۆژ سێ ژەم بۆ ئارامی و ترس و بێ خەوی .

٢٦)-یەك غم زەعفەران +مرز نجوش ١٠٠ غم +گوڵە خەو ١٠٠غم + سنبل طیب ١٠٠ غم دوو کەوچك +یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت ٧ ڕۆژ سێ ژەم بۆ بێ‌خەوی و ترس .

٢٧)-گیا هەنگ بەر +گوزروان یەك کەوچك +یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت بۆ بەهێزی ئەعصاب سێ ژەم ٧ ڕۆژ.

٢٨)-ڕیحانە یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێنت و بخورێنت بۆ تقویەی ئەعصاب سێ ژەم ٧ ڕۆژ .

٢٩)-هەرمێ کێویلە ١٥٠ غم لە لەتکەی شەکراوەکەی + ١ لیتر ئاو بکوڵێنت و بخورێنت بۆ اعصاب(باشە .

٣٠)-شەمامە+ گەنمی برژاو بە یانیان بخورێنت بۆ واس واس و ترس باشە حافیزەی مێشك بەهێز دەکات.

٣١)-گیای خاوێ ١ کەوچك + یەك پەرداخ ئاو دوای کوڵاندن بخورێنت ڕۆژی سێ جار بۆ بەهێزبونی مێشك باشە.

٣٢)-تەماتە جنانی ٥دانە +قەیتەران +هەزبی +ڕازیانە یەکی ٢٠غم +٥ دانە تۆوی تەماتە جنانی +٢ پەرداخ ئاو بە دو ژەم لە ڕۆژێکا بخورێنت ٧ ڕۆژ بۆ ئەعصاب .

٣٣)-گوڵە خەشخاش +گوڵە گوێزوان +گوڵە وەنەوشە +گوڵاڵە سورە یەك کەوچك +یەك پەرداخ ئاو بکوڵێنت و بخورێنت بۆ ئەعصاب ئارامی و شلیقە .

٣٤)-گوێ مشك +وەنەوشە یەك کەوچك +یەك پەرداخ ئاو بکوڵێنت و بخورێنت سێ جار بۆ ئارامی ئەعصاب بێ خەوی.

٣٥)-کرمی ئاو گڵ(گڵ خۆرکە)٥٠ غم بکو تری و بخری لە تەوقی سەری ئەوانەی اعصابیان هەیە و تورەن شەو پێوەی بێ چاك ئەبێ.

٣٦)-گیا مەنگ (گوڵە بەفرین)یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێنت و بخورێ ماوەی ١٠ ڕۆژ سێ جار بۆ(ضعفي اعصاب)باشە.

٣٧)-گوڵە سەعات دوو کەوچك +زەنجەفیل یەك کەوچك +یەك پەرداخ ئاو بکوڵێنت و بخورێنت سێ جار بۆ ئازاری ئەعصاب و بێ خەوی .

أعصاب ، مێشك

## دەرمانی نارام بەخش و نازارو شەقیقە

١)-گوڵە ناسۆ +گوڵە گوڵزروان یەك کەوچك +یەك پەرداخ ئاو بکوڵێنێت بخورێت رۆژی سێ جار بۆ ئارامی و شقیقە و ترس .

٢)-گوڵاڵە سورە (شقائق)جاری یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێنێت بۆ شقیقە و سەر ئێشەی توند .

٣)-دەرمانە ئازار (گوڵە دەوری)یەك کەوچك لە گوڵەکەی +یەك پەرداخ ئاو بکوڵێنێت بۆ گەشکەی منداڵ زۆرباشە

٤)-گوڵە دەوری +رەشکە +هەزبی جاری یەك کەوچك +یەك پەرداخ ئاوبکوڵێنێت بخورێت رۆژی دو جار بۆ ئازاری ئەعصاب ئێسقان و فکرو هۆش .

٥)-کلکە رێوی +زەنجەفیل یەك کەوچك +یەك پەرداخ بکوڵێنێت و رۆژی سێ جار بخورێت بۆ شەقیقە و سەر ئێشە ی توند .

٦)-حێل +زەنجەفیل یەك کەوچك +یەك پەرداخ ئاو بکوڵێنێت و بخورێت ٣ژەم لەرۆژێکدا بۆ بێ خەوی و بێ قەراری.

٧)-تەرخون ١کەوچك +١پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت رۆژی ٢ جار بۆ بێ خەوی .

٨)-گوڵە ئاڵوز +گوڵە گوڵزروان +هەزبی لە هەمویان ٥٠ غم + سێ پەرداخ ئاو بە سێ جار لە رۆژێکدا بخورێت ماوەی ٧ رۆژ بۆ شەقیقە و سەر ئێشەی توند .

٩)-کەما یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێنێت بۆ ١جار رۆژی ٣جار بخورێت بۆئارامی ئەعصاب.

١٠)-گوڵە سورە +گوڵومنە وشە +گوڵە گوڵزروان ١کەوچك +١پەرداخ بکوڵێنێت بۆ ١جار رۆژی ٣جار بۆ شقیقەو ئەعصاب وبۆبێ خەوی .

١١)-گەڵابی١کەوچك +١پەرداخ ئاو بکوڵێنێت بۆ١جار رۆژی ٣جار بۆ ئارامی .

١٢)-گوڵە خەلات (رەشە دەرمان ) +گوڵزروان +گوڵە ماهور یەکی ٥٠ غم ١کەوچك +١پەرداخ ئاو بکوڵێنێت بۆ جارێك رۆژی سێ جار ٧ رۆژ بۆ شقیقە .

١٣)-دو سەلك پیازی نێرگس + یەك پەرداخ شیر دابنرێ بۆ ماوەی دوو سەعات دوای بخورێت بۆ سەر ئێشە باشە.

١٤)-مۆرد +خەنە بۆ سەر ئێشە چارەسەر دەکات .

١٥)–هەزبی +گولاسورە +بەیبون +رازیانە یەکی ٥٠ غم ئەمجا یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکولێت بخورێت رۆژی سێ جار بۆ سەر ئێشەو شەقیقە .

١٦)–ماڵە کوك +گوڵە باخ +بەیبون دوو کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکولێت و بخورێت سێ ژەم بۆ ئەعصاب و سەر ئێشەی دائمی .

١٧)–چا مادەیەکی ئارام بەخشە .

١٨)–وەنەوشە یەك کەوچك +یەك پەرداخ ئاو بکولێ و بخورێ بۆ ئەعصاب و بێ خەوی ئارام بەخشە .

١٩)–شەوتو(چنور) + دارچینی +مقل ازرق+زەنجەفیل لە هەمویان دوو کەوچك +یەك پەرداخ بکولێت و بخورێ بۆ شێت و پەرکەم ، ئارام بەخشە.

٢٠)–مۆرد +ئاردی نوك +ئاردی جۆ +قاوە +گوڵی پونگە +خەنە یەکی یەك پیاڵە + ٥ دانە هێلکە زەردێنەکەی بگریتەوە .. بۆ سەر ئێشە دایمی سێ شەولەسەر یەك .

٢١)–مێخەك +توێکڵی هەنار +توێکڵی گوێز یەکی ١٠٠ غم + یەك لیتر ئاو ماوەی یەك سەعات بکولێت بۆ ئازاری دەم و دان غەرغەرەی پێ بکرێ بۆ تشنجی عەزەلات پێ ی چەور بکرێ.

٢٢)–گیا خاوێ یەك کەوچك +١,٥ پەرداخ ئاو بکولێت و بخورێت بۆ ئازار و دەمار گرژی و ئارام بەخشە .

٢٣)–گیا چنور یەك کەوچك +یەك پەرداخ ئاو بکولێت و بخورێت ئارام بەخشە وە خەو هێنەرە.

٢٤)–زەردەچەوە +دارچینی لە هەردوکیان یەك کەوچك +یەك پەرداخ ئاو بکولێت و بخورێت بۆ بێ خەوی زۆرباشەوخەوهێنەرە .

٢٥)–گژنیژ ٥٠ غم +بەیبون ٥٠ غم+گولاڵە سورە ٢٠ غم بە کوتراوی ئەمجا جاری یەك کەوچك +یەك پەرداخ ئاو بکولێت و بخورێت و خەو هێنەرە .

٢٦)–گەڵای هەرمێ کێویلە + گوڵە نیسان یەکی ٥٠ غم دواى جاری دوو کەوچك +یەك پەرداخ ئاو بکولێت و بخورێت بۆ بێ خەوی باشە ،خەو هێنەرە .

٢٧)–هارلوەی رەگی درکە کەر کوڵ (درکە خەو) یەك کەوچك +یەك پەرداخ ئاو بکولێت و بخورێت بۆ بێ خەوی خەوهێنەرە .

٢٨)–هەزبی +گژنیژ +گنور +مێخەك ئەمانە خەو هێنەرن ئارام بەخشن لە هەرکامیان بێ یەك کەوچك +یەك پەرداخ ئاو بکولێت و بخورێت .

# نەخۆشیەکانی میز بەخۆدا کردن و میز گیران و سوزەنەك و میزی خوێناوی

١)-ڕازیانە +ئەنەنتین یەکی ٥٠ غم +دوو لیتر ئاو جاری یەك پەرداخ ئاو بە کوڵاوی سێ ژەم بخورێت بۆ میزە چرکە وسوزە نەك .

٢)-ڕازیانە +گەزنە +٢,٥٠ لیتر ئاو بکوڵێت جاری یەك پەرداخ ڕۆژی سێ جار بخورێت بۆ میزە چرکە ٧ ڕۆژ .

٣)-٥٠٠غم پیاز +٥٠٠ غم ترشە سماق +دوو پەرداخ ئاو بکوڵێت ڕۆژی دوو پیاڵە بدرێ بە منداڵ میز بەخۆیدا ناکات .

٤)-بەڕو بە جەوتەکەیەوە یەك بەڕو بە یەك جار لەرۆژێکدا بکوترێ وەك چا بیدرێ بەمنداڵ میز بە خۆیدا ناکات و میزە چرکەی نامێنێ .

٥)-ئاردی جۆ +گوڵە باخ +ڕەگی کەما یەکی ٥٠ غم +١٥٠٠ غم هەنگوین ژەمی یەك کەوچك بۆ ماوەی ٥ ڕۆژ منعی میز بە خۆدا کردن دەکا .

٦)-جۆورچ + گەلا گوێز + گەلا گەزنە + پەیکوڵ یەکی ٥٠ غم + ٢ لیتر ئاو بکوڵێت ٣ ژەم جاری یەك پەرداخ بۆ میزە چرکە و سوزەنك .

٧)-کاشمە + زنیان +ڕازیانە + گوڵە پەنجە یەکی ١٠٠ غم + ٢ لیتر ئاو بکوڵێت ٣ ژەم ژەمی یەك پەرداخ بۆ میزە چرکە ومیز گیراو باشەو بەری نەدات.

٨)-دڕکە کەرکوڵ ژەمی دوو کەوچك بکوڵێت لە یەك پەرداخ ئاو میز کردن ئاسان دەکات .

٩)-گوڵەمەنگ +بەیبون + پەیکوڵ +گەزنە یەکی ٥٠ غم + سێ پەرداخ ئاو بکوڵێت و ژەمی یەك پەرداخ ڕۆژی سێ ژەم بۆ سوزنەك و میز کردن .

١٠)-مێوە مارانە +تەماتە مارانە + گوڵە وەنەوشە یەکی ٥٠ غم ئەمجا جاری یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت سێ ژەم بخورێت بۆ میزی خوێناوی .

١١)-١٠٠غم لەناولی + ١٠٠ غم قەیتەران +٥٠٠غم شملی جاری یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت ڕۆژی دوو جار بۆ میز کردن و میزە چرکەو سوتاندنەوەی میزەڵان .

١٢)-یەك پەرداخ ئاوی شوتی + یەك پەرداخ ئاوی لیمۆی شیرین بۆ یەك جار ڕۆژی سێ جار بخورێت دوای کولان بۆ میز گیران باشە، میز بەر نەدات .

١٣)–مەرزنگ +رەشکە +پەیکوڵ +تۆوی شێلم یەکی ١٠٠٠غم + دوو لیتر ئاو یەک سەعات بکوڵێت هەموی بە سێ ژەم لە رۆژێکا بخورێت ٧ رۆژ بۆ إلتهاباتی میزەڵدان وسوزنەک .

١٤)–سمێ + زەنجەفیل +بناوچ +گوڵی وەنەوشە یەکی ٥٠ غم ئەمجا دوو کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت رۆژی دوو ژەم بخورێت بۆ کەمەر شاڵی میز بەخۆکردنی .

١٥)–گوێ مشکە +گوڵە وەنەوشە +رازیانە یەکی ٥٠ غم یەک کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت و رۆژی سێ ژەم بخورێت بۆ میزە چرکە .

١٦)–تۆو قانگ +تۆو کاهو +تۆوە کەرەوز یەک کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت سێ ژەم لە رۆژێکدا منعی میز بە خۆدا کردن دەکا لەگەڵ خوێن رژی میز .

١٧)–توێکڵی هەنار + گەڵا بەرو بە کوترلوی یەک کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت چەند جارێك بۆ ئەوانەی میز رانەگرن چاك دەبن .

١٨)–گوڵی یاس کەوە +وەنەوشە +هێرۆ یەکی ٥٠ غم ئەمجا دوو کەوچک +دو پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت بۆ میزە چرکە ومیز گیران باشە .

١٩)–طباشیر صدفی + حێل +بیبەری شیرین +رەشکە +گوڵە بەیبون یەکی ١٠٠غم تێکەڵ بکە ئەمجا دوو کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت پێش نان رۆژی سێ جار بۆ میزی خوێناوی .

٢٠)–قازی آلغا + گەزنەیەکی ١پیاڵە +٢پەرداخ ئاو بکوڵێت بخورێت چارە سەری میز گیرانو میزە چرکە دەکات .

٢١)–رەگی دڕکەخەو (دڕکە کەرکوێ) جاری ١کوچك +١پەرداخ ئاوی گەرم بخورێت بۆ میز بەخۆ داکردنی شەوی مندالێ.

٢٢)–وسمەوەك هەریرو نوێ نەعك بنرێ لەبەرموسە لأنی کەمیزی رانگرێ ٢جار دووبا - رەی بکەیتەوە چارەی دەکا ت .

٢٣)–شمڵی +رازیانە ٢کەوچك +١پەرداخ بکوڵێت دوای جاری ١کەوچك لە دەرماناوەکولاوە کەی بدەرێ میزی بەردەدات .

٢٤)–گەزنە +رازیانە ٢کەوچك +١پرداخ ئاوبکوڵێت ئە مجا جاری ١کەوچك چێشت بەرێ بەمندڵە میز گیراوەکە چارەی دەکات لە١سەعاتدا ٤جاری بەرێ .

٢٥)–گەزنە + شملی +رازیانە ٢کەوچك + یەک پەرداخ ئاو بە دوو جار بکوڵێت و بە دوو جار بیدەی بە منالەکە بۆ میز گران .

٢٦)-پەیکوڵ +گەزنە +گەڵا گوێژ +پونگە +قەیتەران +قازی اغا +شملی بە ئەندازەی دوو پیاڵە +دوو پەرداخ ئاو بکوڵێت و ڕۆژی ٤ جار یەک مانگ بۆ سوزنەک بۆ ئەوانەی توشی سوزەنەک بوون.

## نەخۆشیەکانی بادا ری و هەوکردنی جومگە (رماتزیم و مفاصل)

١)-تونکل و گەڵای بی ٢٠٠ غم +١,٥٠ لیتر ئاو بکوڵێت جاری یەک پەرداخی لێ بخورێت ماوەی ٧ ڕۆژ بۆ ڕۆماتیزم و تشنج .

٢)-پەلپینە دوو کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت بۆ ئازاری جومگە بۆ دەنگ یان قرتە قرتی جومگە زۆر باشە .

٣)-گوڵاڵە سورە + زوفا + گوڵە گوێزەوان بکوڵێت و بخورێت بۆ ئازاری روماتیزم .

٤)-چنارەکەڵە هاڕاوەکەی + ماست ئەکرێ بە مەلهەم بۆ چەور کردنی شوێنی بادا ری (ڕۆماتیزم)زۆر باشە.

٥)-گوڵ وگەڵای گەڵا پەژم ٢٠غم + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت ڕۆژی دوو جار بەکار بێ بۆ ڕۆماتیزم و تشنج.

٦)-دۆشاوی گوڵە خەنازیل (خوێن بەن) شوێنی بادا ری پێ چەور بکە بۆ ڕۆماتیزم زۆر باشە.

٧)-هەزبی + چا کێوی یەکی ٥٠ غم + یەک لیتر ئاو بکوڵێت بە دوو جار ئاوەکەی بخورێ ماوەی ١٥ ڕۆژ بۆ ڕۆماتزم و تشنج .

٨)-پیازە خوگانە بە کوترلوی + ڕۆن زەیتون سور بکرێتەوە وە بنرێ لە باریکایی پشت شەو بۆ ئازار فقراتی باریکایی پشت .

٩)-گوڵە پونگە + گوڵە بەیبون + قازی ئاغا + ئاردی جۆ وەک نیو نەمەک بکرێ بە موشەماو بنرێ لە جومگەی باریکای پشت بۆ ئازاری باریکایی پشت .

١٠)-گەڵای سنوبەر دۆشاوی لێ دەگیرێ جومگە و ئەژنۆکانی پێ چەور بکرێ بۆ ئازاری روماتیزم .

١١)-زەردەچەوە + دارچینی + زەنجەفیل یەکی ٥٠ غم ئەمجا یەک کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت ڕۆژی دوو جار بخورێت بۆ ڕۆوماتیزم و جومگە .

١٢)–مەزبی + نەعنا + پونگە + گەزنە + بەیبون +زیرە + گەڵا گوێژ جاری دوو کەوچك + ١,٥ پەرداخ ئاو بکوڵێ و بخورێ ڕۆژی سێ جار بۆ هەو کردنی ڕۆماتیزم و جومگە .

١٣)–گوڵە نەعنا یان پونگە + ئاردی جۆ وەك نیو نمەك بنرێ لە جومگە بایەبی ڕۆماتیزمەکەی ڕادەکێشێ و نایمێنێ.

١٤)–گەڵا گوێژ + گوڵاڵە سورە + تاڵیشك + زیرە + تۆو شویت جاری یەك پیاڵە لە هەمویان + دوو پەرداخ ئاو بکوڵێ و بخورێ ماوەی ١٥ ڕۆژ بۆ(داء النقرس).

١٥)–مێخەك + بیبەر + زەنجەفیل + ئاڵەت + دارچینی + گوێز یەك پیاڵە لە هەمویان + ٤ زەردێنە ی هێلکە بکرێ بە موشەما و لە باریکایی پشت بۆ(انزلاق)و هەتا قاچی پێچەوە بکە.

لە ناو حەمام کاتی خۆشتن دوای ئەوەی سەرمای بێت لە ناو جێدا پشو بدات ئەگەر یەك کەوچك زەنجەفیل + دوو کەوچك هەنگوین تێکەڵ بکەی و بخورێ سێ ژەم باشترە .

١٦)–گەڵای بی یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت ڕۆژی سێ جار بۆ ڕۆماتیزم .

١٧)–پونگە +مەزبی +مێخەك +توێکڵی هەنار +بەیبون +سیر +سوسی جۆ یان گەنم وەك نیو نمەك و دەستە نەرمە بنرێ لە جومگە ئازارەکە لادەبات .

١٨)–گوڵاڵە سورە یەك کەوچك +دو پەرداخ ئاو بکوڵێت و بە دوو ژەم لە ڕۆژێکدا بخورێت بۆ ڕوماتیزم .

١٩)–قارچکە دارانە +ئێسقانی هاراوە +سرکە تێکەڵاو بکرێ بنرێ لە جومگە یان پێی چەور بکرێ باشترە بۆ ڕوماتیزم .

٢٠)–یەك کەوچك گوڵە زەنکوڵ +٥٠ غم هەزبی + ٥٠ غم ڕەشکە + سێ پەرداخ ئاو بە سێ ژەم لە ڕۆژێکدا بخورێت بۆ ڕوماتیزم .

٢١)–تەرخون یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت ڕۆژی دوو جار بخورێت بۆ ڕوماتیزم.

٢٢)–١٠٠ غم بناوە تۆم گەڵا و گوڵی + یەك لیتر ئاو بکوڵێت بە سێ جار بە یەك ڕۆژ بۆ ئازاری ڕوماتیزم .

٢٣)–گوڵە هەزار + ڕەشکە یەکی ٥٠ غم ئەمجا یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت ڕۆژی سێ ژەم بۆ ئازاری ڕوماتیزم .

٢٤)-زیرەی سەوز ١٠٠غم + سێ پەرداخ ئاو بکوڵێت و بە رۆژێك بە سێ جار بخورێت بۆ ژان و بای رۆماتیزم .

٢٥)-زیرەی رەش یەك کەوچك +یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت بۆ ژان و بای رۆماتیزم .

٢٦)-تەرپی یان تەڵەمار یان مەرگە مار ١٠ غم لە تۆومکەی ٢٠٠ غم بەیبون بکوڵێت لەگەڵ یەك پەرداخ ئاو بخورێت بۆ ئازاری روماتیزم .

٢٧)-دارچینی +گوڵزوان +زەنجەفیل یەکی ١٠ غم + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت بخورێتەوە رۆژی دوو جار بۆ ئازاری روماتیزم .

٢٨)-تۆو شادان ٥٠غم + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت بخورێت بۆ ئازاری جومگە .

٢٩)-بیبەری تون +سیر یەکی ١٠ غم بکوڵێت و بخورێت لەگەڵ یەك پەرداخ ئاو بۆ روماتیزم و جومگە و ئازاری ئێسقان .

٣٠)-رەگی پیازە گوڵانە +زەنجەفیل +(مقل ازرق)بکرێ بە حەب رۆژی سێ حەبی لێ بخورێت بۆ روماتیزم لەگەڵ ئارد بکرێ بە حەب .

٣١)-گەڵای بناوێ ١٥٠ غم +١٠٠٠ غم گەڵا گوێز + دوو لیتر ئاو بکوڵێت رۆژی سێ جار جاری دوو پیاڵە پێش نان ماوەی ٧ رۆژ بۆ ئازاری روماتیزم و جومگە .

٣٢)-دۆشاوی کەمای زەرد کە بە شێوەی تایبەتی دەگیرێ بۆ روماتیزم و ئازاری جومگە.

٣٣)-گەڵا و گوڵە شەم دانی + گوڵە بەیبون +هەمزبی +گەڵا بەرو +٤ لیترئاو بکوڵێت تا خەست دەبێتەوە ئەمجا جومگە و عەزەڵاتی رۆماتیزمی پێ چەور بکرێ چاك ئەبێ.

٣٤)-٥٠٠ غم مراد کە یان (گیا دوبشك)+ ٥غم بیبەری تون بکرێ بە نیونەمەك بنرێ لە جومگە و ئەژنۆ ئازاری روماتیزم چارە دەکات.

٣٥)-سمل + وەنەوشە + زەنجەفیل +بناوێ دوو کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت رۆژی دوو ژەم ١٥ رۆژ بۆ روماتیزم .

٣٦)-ئاوی تەماتە یەك پەرداخ + ئاوی ترێ یەك پەرداخ بۆ ژەمێك رۆژی دوو ژەم بخورێت و جومگەکان بەهێز دەکات.

٣٧)-گەڵا گوێز +وەنەوشە +گوڵزوان یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت رۆژی دوو جار بۆ ئازاری روماتیزم .

٣٨)-عارەقە نەعنا یان پونگە سێ ژەم ژەمی پیاڵەیەك بخورێت بۆ إلتهابات ئازاری روماتیزم.

٣٩)-ڕێحانە + گوڵی پونگە یەک کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت بخورێت ڕۆژی دوو جار بۆ ژانوبای ڕۆماتیزم و جومگە و ئەژنۆ و ئێسقان.

٤٠)-هەزبی +گوڵە سورە + بەیبون +ڕازیانە یەک کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت ڕۆژی سێ جار بۆ ئازاری ئێسقان و جومگە و ڕوماتیزم .

٤١)-٥ دانە لە تۆوی تەماتە جنانی + هەزبی +ڕازیانە +قەیتەران یەکی ٢٠ غم + دوو پەرداخ ئاو بکوڵێت و ڕۆژی دوو ژەم بخورێت ٧ ڕۆژ بۆ ڕوماتیزم .

٤٢)-گوڵی خەشخاش + گوڵی گوزروان + گوڵی وەنەوشە + گوڵاڵە سورە لە هەموی دوو کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت بۆ ڕوماتیزم .

٤٣)-گیا ژانە (گیا ئازار) یەک کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت بۆ ڕوماتیزم .

٤٤)-٢٠ غم ئالەت + ٣٠ غم زەنجەفیل + یەک کفم هەنگوین ئەمجا جاری یەک کەوچک ڕۆژی سێ ژەم بخورێ بۆ ڕوماتیزم .

٤٥)-پێست و گەڵای داربی ١٠٠ غم + یەک لیتر ئاو بکوڵێت جاری دوو پیاڵە بخورێ ماوەی ٧ ڕۆژ .

٤٦)-پەڵپینە دوو کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت بۆ لینجاوی جومگە ی ئازار و ئێش و جومگە .

## ئازاری ئێسقان و جومگە و شکست

١)-گیا مەلهەم + گەڵا بەڕو + گەڵا و گیای ڕکێشە + گەڵا پەمو بکرێت بە دۆشاو بە کوڵان دوای +ڕەزڵە + سرکە دیسان بکوڵێت تا خەست ئەبێتەوە بۆ ئازاری ئێسقان و ئەژنۆ پێ ی چەور بکرێ.

٢)-هاز +گوڵاڵە سورە ١کەوچک +١پەرداخ ئاو بکو ڵێت بۆ جارێک ڕۆ ژی ٤جار بخو رێت ماوە ی ١٥ڕۆژ بۆ سیلی ئێسقان.

٣)-دەرمانە ئازار (گوڵە دەوری) +بەیبون +هەزبێ + ڕە شکە ڕۆژی ٢جار جاری ١کەوچک بۆ ١پەرداخ ئاو بکوڵێت بخورێت بۆ ئازاری ئێسقان.

٣)-کەلەرم بۆ شکستەو ئازاری ئێسقان چونکە کا لسیۆی زۆرە .سپێناخ بۆ بەهێز کردنی ئێسقان باشە.

٤)-سەلەمکە بۆ شکستە زۆر باشە خۆی لە گرتنەوە چونکە کالسیۆمی زۆرە ڕۆژی ١٠٠غم +١پەرداخ ئاوی کوڵاو.

٥)-هەنجیر ١٠٠ غم +٢پەرداخ شیر بکوڵێت بەیانیان بخورێت بۆ شکستە باشە .

٦)-گەڵای لەیسی ڤیتامین (D) تیایەبۆ ئێسقان باشە .

٧)-وێنجە +ڕەشکە یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو ڕۆژی دو جار بخورێت بۆ شکستە باشە بۆ إلتهاباتی ئێسقان کالیسیۆمی تێدایە .

٨)-سێ پەڕە +بەیبون +گوڵی وەنەوشە یەکی ١٠٠ غم + یەك لیتر ئاو بکوڵێت ڕۆژی دوو جار جاری یەك پەرداخ بخورێت بۆ ئازاری جومگە و ئێسقان .

٩)-پسل (گیا نۆخەوا)١٠٠ غم + یەك لیتر ئاو بکوڵێت بە سێ ژەم لە ڕۆژێکدا بخورێت بۆ ئاوسان و هەوکردنی ئێسقان و جومگە بۆ ٧ ڕۆژ .

١٠)-کوزەڵە + لۆخ دوو کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت بۆ ئازاری ئێسقان.

١١)-هەزبی + گوڵاڵە سورە + بەیبون +ڕازیانە یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت بۆ جارێك ڕۆژی سێ ژەم بخورێت بۆ ئازاری ئێسقان و جومگە .

١٢)-خورما +دوگ بە کوترلوی وەك نیو نەمەك بنرێ لە شوێنی شکستە و ئازار و جومگە و باریکایی پشت ئازارەکەی چاك دەکات .

١٣)-گوڵی خەشخاش +گوڵە سورە + گوێزوان +وەنەوشە یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت بخورێت بۆ ئازای ئێسقان و جومگە .

١٤)-هەڵوژە خواردنی باشە بۆ ڕزنی جومگەکان چونکە ڤیتامین (C)تێدایە .

١٥)-مازو +سیچکە + جەوت +گزگڵ بکورتێ بیێژرێتەوە +خەنە وەك مەڵهەم شەو بنرێت لە ژێر پێ بۆئەوانەی ئێسکی زیادەیان هەیە بەنایلون شەو ببەسترێ ٣-٥ شەو بەکار بهێنرێت ئێسکە زیادەی قاچ چارە دەکات.

## بۆ دەواڵی

١)-بەڕوە سپی + گەڵاو بەڕو بکوڵێت بە ئەندازە ئاوەکەی بخورێتەوە بۆ دەواڵ باشە .
٢)-گوڵە خەڵات یان (گوڵە ئەورین)+ مەزبی یەکی ١٠٠ غم ئەمجا ژەمی دوو کەوچك+یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت سێ ژەم بۆ دەواڵ.
٣)-سپێناخ ڤیتامین D و کالیسیۆمی تێدایە بۆ ئەوانەی ئێسقانیان نەرمە بیخۆن چاك دەبن.
٤)-سەلکی نێرگس (پیازەکەی) بە کوتراوی + مازو ی هاڕاو +خەنە وەك هەویر و نیو شەمە لێ بکرێ و بنرێ لە قاچ (پێ) بۆ ئەوانەی کە دکتور پێیان دەڵێت ئێسکی زیادە لە قاچ یان پاژنە دا دروست بووە ٤ شەو ئەم دەرمانەی لێ نێت چاك دەبێ ، ئەوەی ئێسکی زیادەکا نی‌یە بەڵکو قاچی کوتراوە بوە بە مێخەکە لە ژێر پێ‌ی یان لە پاژنەی دا بەم دەرمانە چاك دەبێ و وە بۆ هەموو مێخەکەیەکی تریش باشە لای دەبات .
٥)-بۆ دەواڵ گیای ماڵە کوك + گەڵا تو بە وشکی یەکی ١٥٠ غم ئەمجا جاری یەك پیاڵە+دوو پەرداخ ئاو بکوڵێت بخورێ رۆژی ٢ جار ماوەی ١٥ رۆژ بە لەفاف بیبەسترێ پوز و قاچ و قولیان .

## زیاد بونی ئارەزوی پیاوەتی و بەهێزی تۆوی هێلکە گون

١)-زەنجەفیل + گوڵاو بکرێ بە مەلهەم باریکای پشتی پێ چەور بکات لەبەر هەتاو ڕاکێشێ + خواردنی بادلم + خورما + هەنگوین + زەنجەفیل + رۆنی زەیتون + توی سپی رۆژی سێ جار بۆ ئەو پیاوانەی بێ هێزی جنسیان هەیە زۆر بەکار دەبن.
٢)-هەنگوین + ئاردی نۆك + زەردێنەی هێلکە بکرێ بە مەلهەم و بدرێ لە باریکایی پشت وەك موشەما شەوی یەك جار ٧ شەو زۆر بەکار دەبێ .
٣)-زەنجەفیل + زەعفەران + هەنگوین دوای تێکەڵاو کردن ژەمی دوو کەوچك بخوات لەگەڵ خواردنی ئەم میوە و شیرینی و چەوریانە وەك شەربەتی میوە وەك نارگیل + شێلم لە ئاوشیردا بکوڵێت + خەرباری ماسی یانی گونی‌ماسی وەك بەز وایە .

٤)-میخەک ١٥٠ غم + زەنجەفیل ١٥٠ غم + یەک کفم هەنگوین سێ جار لە رۆژێکدا جاری دو کەوچک.

٥)-پیاو نابێ مادەی محرک و هۆرمۆنی ژنانە بخوات وەک قاوە خردل کافور رازیانە (شیر و ماست)نەک ئاژەڵەکە گیای رازیانەی خواردبێ.

٦)-ئەو پیاوانەی هێلکە گونیان ناتەواو نییە و بچوک نییە لە کاتی جماع ناتوانن ئەوە هۆی گۆڕینی هۆرمۆنی نیە بۆ مێزیە بە هۆی کرمەکانەوە وەک کرمی ناوسک اسکارس ،جاری نیو پیاڵە بەڵاڵوک وەک چا بکوڵێت و بخورێت بەیانیان بە ناشتا.

یان گیای هوجونە جاری یەک پیاڵە بە کوتراوی و بە کوڵاوی وەک چا بخورێت بە ناشتا

یان ناوکە کولەکە ٢٥٠ غم + شەکر بخورێ .

یان رەگی هەنار ١٠٠ غم بۆ جارێک سی رۆژ بخورێ بەیانیانبە ناشتا وەک چا بکوڵێ و بخورێ .

٧)-گەزنە + قازی ئاغا + گوڵەپونگە + مقل ازرق + رۆنی گەرچەک بکرێ بە شاف و بۆ کونی زەکەری پیاو و إلتهاباتی جنسی نامێنێ .

٨)-شۆرە + باروت + گوڵی پونگە + چەوری بزن + تونکڵی هەنار بۆ نەخۆشی سفلس بکرێ بە شاف بۆ کونی زەکەر بە باریکی وەک دەنکە شقارتە .

٩)-ئاوی سرکە یان ئاوی لیمۆی ترش یان ترشە سماق یەک جار جاری یەک پیاڵە بۆ ئەوانەی جنسیان زۆر بەهێز ە بێ هێزی دەکات .

١٠)-ئاوەی برژاو وەک چا رۆژی سێ جار جاری دوو پیاڵە + یەک پەرداخ ئاو بخورێتەوە جنس بێ هێز دەکات .

١١)-رازیانە و خردل و کافور لە هەمویان ١٥٠ غم ئەمجا لە یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت ماوەی ٥ دەقیقە ئاوەکەی بخورێتەوە جنس بێ هێز دەکا .

١٢)-گوڵە بەیبون + گوڵە پەزم + گیا نانەشان + گیا هەلوک یەکی ٢٠٠ غم بە کوتراوی رۆژی سێ جار جاری یەک پیاڵە + دو پەرداخ ئاو بکوڵێ و بخورێ ٩-١٠ رۆژ بۆ بێ هێزی جنس بەهێز دەبێ .

١٣)-کونجی + هەنگوین + رۆنی زەیتون جنس و حافزەی مێشک و نێسک بەهێز دەکات .

١٤)-کافور + رازیانە + خردل + شیر ماست + قاوە + مەی ئەمانە نەخوات دوای(عادەت) جوت بێ ئەوا کوڕیان دەبێ ئەگەر ئەمانەش بخوا کچیان دەبێ ..

١٥)-بادەم +گوێز +رۆن زەیتون +رۆن کونجی + بستە یان علی بابا + تووی شیرین+خورما +هەنگوین هەموی سێ ژەم ژەمی یەك کەوچك بۆ هەوەسی پیاو .

١٦)-مێخەك نیو مسقال + یەك پەرداخ شیری مانگا بە تازەیی بخورێت ئارە زوی تۆوی پیاو زیاد دەبێ.

١٧)-یەك مسقال زەعفەران + یەك کەوچك زەنجەفیل + ١٠٠ غم هەنگوین بخورێت بە ژەمێك هەوەسی پیاوەتی زیاد دەکات .

١٨)-تۆوی تەربی یەك کەوچك + دوو پەرداخ ئاو دوای کوڵان + شەکر بخورێت بۆ زیا کردنی ئارەزوی هەوەسی پیاوەتی .

١٩)-هەنجیر ١٠٠ غم + دوو پەرداخ شیر بکوڵێت بە یانیان بخورێت بۆ بە هێزی هەوەسی پیاوەتی.

٢٠)-گوڵی و بناوێ ١٥٠ غم + تۆو پیاز ٥٠ غم + یەك لیتر ئاو دوای کوڵان بە یەك رۆژ بە سێ ژەم ئاوەکە بخورێتەوە بۆ بە هێزی ئارەزوی پیاوەتی .

٢١)-رەگی گوڵە شلێرە + سەلکی نێرگس یەکی ١٠٠ غم + دوو پەرداخ ئاو بە دوو جار لە رۆژێکدا بخورێت بۆ بەهێزی ئارەزوی پیاوەتی.

٢٢)-ئاوکی لۆکە یەك کەوچك + جەوت یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت بۆ زیاد کردنی ئارەزوی پیاوەتی .

٢٣)-گوڵە مێخەك + گوڵە وەنەوشە + تۆوە بناوێ یەکی ٥٠ غم + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت رۆژی دو جار بۆ ئارەزوی پیاوەتی .

٢٣)-زەمقە ینە +تۆو بناوێ +کاکڵە گوێز یەکی ٢٠٠ غم + یەك کفم هەنگوین ژەمی دوو کەوچك پێش نان بخورێت بۆ بەهێزی ئارەزوی پیاوەتی .

٢٤)-تۆوی گەزنە یەك کەوچك + تۆوی پیاز یەك کەوچك + دو پەرداخ ئاو بکوڵێت بە یەك رۆژ بە دوو ژەم بخورێت واتە جاری یەك پەرداخ بۆ بە هێزی هەوەسی پیاوەتی .

٢٥)-گوڵە سەوسەن ١٠٠ غم + هەنگوین یەك کفم تێکەڵاو بکرێت جاری دوو کەوچك پێش نان بخورێت بۆ بە هێزو و زۆربونی ئارەزوی پیاوەتی .

٢٦)-گوڵی لالۆ عەباس + تۆوی بناوێ + تۆوی پیاز یەکی ٥٠ غم + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت بۆ ئارەزوی پیاوەتی بەهێز دەکات .

٢٧)-گوڵە موسی (گوڵە سارێژ)٢٠٠ غم + هەنگوین یەك کفم تێکەڵاو بکرێت جاری سێ کەوچك چێشت پێش نان بخورێت بۆ بەهێزی پیاوەتی .

٢٨)-گوێزی هندی + گوێز + بادەم + زەنجەفیل + بیبەر یەکێ ٢٠٠ غم بکوتڕێ + یەک کفم هەنگوین سێ ژەم ژەمی دوو کەوچک بخورێت بۆ ئەو ژنانەی منالیان نابێ .

٢٩)-عارەقی نەعنا یان پونگە ئارەزووی پیاوەتی زیاد دەکا ژەمی یەک پیاڵە ڕۆژی سێ جار شەویش جارێك كاتی خەو .

٣٠)-ڕۆن زەیتون ١٠٠ غم + یەك كفم هەنگوین تێکەڵاو بکرێت ڕۆژی سێ جار جاری یەك کەوچك پێشتان بخورێت بۆ زیاد بونی ئارەزوی پیاوەتی.

٣١)-خورما +گوێنجی + دۆشاوی ترێ + گوێز + هەنگوین یەکێ ٢٥٠ غم تێکەڵاو بکرێ بە یەك جار بخورێت ڕۆژی ٣-٤ ژەم بخورێت بۆ زیاد بوونی ئارەزوی پیاوەتی .

٣٢)-زەردێنەی هێلکە بۆ منال بون بۆ بەهێزی سپێرم باشە بۆ منداڵ بوون ٣٠ غم ئالەت + ٢٠ غم زەنجەفیل + یەك كفم هەنگوین ژەمی دو کەوچك سێ ژەم بخورێت .

٣٣)-ڕێشەن یان گیا لەبان + قەیتەران لە هەردووککیان یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بە سێ جار بدرێ بە منداڵ یانی بە یەك ڕۆژ بۆ ماوەی ٥ ڕۆژ بە ڕەدوام بۆ ئەو منالانەی گونیان ئەئاوسێ فتقیانە چاك دەبێ .

٣٤)-سێو خوگانە + قومام +مێوە مارانە بە ئەندازەی یەك بکولێت تاخەست ئەبێتەوە و ئەبێ بە دۆشاو بۆ فتق و گون ئاوسان پێ چەور بکە.

٣٥)-٥٠ غم پەیکول + یەك شوتی بە تونکلەوە بکولێت + ئاوی لیمۆی ترش + ٥٠ غم گەڵا گوێز +٥٠ غم ڕەگی ـ

هەرێز + یەك لیتر ئاو بە سێ ژەم بخورێت دوای کوڵان ١٠ ڕۆژ بۆ پرۆستات .

٣٧)-پیاز + دوگ سوربکرێتەوە دوای یەك کەوچك چا بیبەر بکەی بەسەریا بخورێت بۆ زیادبوونی ئارەزووی پیاوەتی.

٣٨)-بادەم + کونجی + ڕۆن زەیتون + هەنگوین تێکەڵاو بکرێ ژەمی سێ کەوچك بخورێت بۆ بەهێزی تۆو ئارەزوو.

٣٩)-چرۆ (شکۆلەی دار دەرەوشە ١٠٠ غم) + یەك کفم هەنگوین ژەمی دوو کەوچك بخورێت بۆ بە هێزی تۆو ئارەزو .

٤٠)-ئالەت + دار چینی + کەبابە یەکێ ١٠٠ غم+ یەك کفم هەنگوین سێ ژەم بخورێت جاری یەك کەوچك ئەگەر زەنجەفیل لەگەڵ بێ باشترە .

٤١)-سالمە +وەنەوشە +تۆو بناوێ یەکێ ١٠٠ غم ئەمجا جاری یەك کەوچك + یەك پەرداخ شیر + ١٠٠غم هەنگوین پێش نان بخورێت ڕۆژی دو جار .

٤٢)-رەشەوشە ١٥٠ غم+ رۆن زەیتون ٢٥٠ غم + یەك كفم هەنگوین ژەمی دو كەوچك بخورێت سێ ژەم بۆنارەزوی پیاوەتی .

٤٣)-هێلكە كیسەل +شیری ژ ن بكرێ بە مەلهەم بۆ ئەوانەی كونیان ئاوساوە(قونێن) چەند جارێك چەور بكرێت چاك دەبێ

٤٤)-رۆنی خاكە شیر + دۆشاوی تەماتە مارانە بۆ گونی ئاوساوی پیاوان پێ چەور بكرێ چاك دەبێ.

٤٥)-تریاك + گەرا ماسی بكوترێ و بكرێ بە مەلهەم بۆ ئاوساوی و قونێ چەور بكرێ چەند جارێك چاك دەبێ .

٤٦)-گولاڵە سورە +گەرا ماسی بكوترێ و بكرێ بە مەلهەم بۆ ئاوساوی و قونێ لە چەور بكرێ چەند جارێك چاك دەبێ .

## نەخۆشی گەڕی(دەردە ڕێوی)(داء الثعلب)

١)-گەلای گوڵی لاولاو١٠٠ غم + رازیانە ١٠٠غم + رەشەوشە ١٠٠ غم تۆو كاهو ١٥٠.غم بكوڵێت سێ ژەم + یەك لیتر ئاو بیخوات بۆ موی سەر(داء الثعلب).

٢)-گەڵای مۆرد ١٠٠ غم +وسمە ١٥٠ غم + دوو لیتر ئاو بكوڵێت دوای ٦٠٠ غم رۆنی كونجی تێكەڵاو بكرێت دوای پاڵاوتن دیسان بكوڵێت تا دەبێ بە مەلهەم + ٣٠ غم رۆنی سمنی + ٣٠ غم رەزڵە تێكەڵاو بكرێت و سەری پێ چەور بكرێ بە ئاوی گوڵە هێرۆ بشۆرێ .

٣)-شامپۆی هێرۆ گوڵە بەیبون +گوڵە هێرۆ +شەڵی + ئەسپون یەكی ٥٠ غم + دو لیتر ئاو بكوڵێت بۆ ماوەی یەك سەعات دوای دوو جار سەری پێ بشۆرێ .

٤)-رۆنی زەردێنەی هێلكە + رۆنی مار یان رۆنی چەقەل یان بەزی گورگ + رەشكەی بسوتێنی و بیهاڕێ و بی‌كەی بە مروخ رۆژی دو جار شوێنەكە چەور بكرێ.

٥)-گیا مەلهەم+ گەڵا بەڕو + گەڵا ڕیشە + گەڵا پەمو یەكی ١٠٠ غم + یەك پەرداخ ئاو بكوڵێت وەك دۆشاو خەست بیێتەوە شوێنەكەی پێ چەور بكرێ.

٦)-ڕەنگی توێسی (دركە ئاڵەت) + گەڵا هەنار + گوڵە بەیبون یەكی ١٠٠ غم تا وەك دۆشاوی و خەست ئەبێتەوە بكوڵێت دوای پێ‌ی چەور بكرێت.

٧)-زەل بكوڵێت تا خەست ئەبێتەوە ئەمجا وەك مرۆخ شوێنە ڕوتاوەكەی پێ چەور بكە.

٨)-گوڵی قەنارلی ١٠٠ غم + رۆن زەیتون ١٠٠ غم ماوەی مانگێك هەڵبگیرێ دوای رۆژی دو جار شوێنەکەی پێ چەور بکە .

٩)-پەنجە داڵ + قەیتەران + هەڵوژەی ترش یەکی ٢٠٠ غم تێکەڵ بکرێت و بنرێ لەو شوێنەی مومکەی ڕوتاوەتەوە چەند جارێ مومکە دێتەوە .

١٠)-تۆوی تەربی یەك کەوچك + دوو پەرداخ ئاو بکوڵێت ئاوەکەی لەگەڵ شەکر بخورێتەوە بۆ(داء الثعلب)باشە .

١١)-قاقلی بەهار (شەماڵ گیر) + بەیبون + گژنیژ یەکی ١٠٠ غم بکوڵێت سێ ژەم ژەمی یەك پیالە بۆ(داء الثعلب)باشە لە دوو لیتر ئاو بکوڵێت.

١٢)-گەڵا و گوڵی گوڵە بەڕۆژە + قەزوانی شین + بەلاڵوك بە وشکی و هاڕاوەی یەکی ٥٠ غم+یەك لیتر ئاو بکوڵێت سێ ژەم بخورێتەوە ماوەی ١٥ رۆژ گەڵاو تۆوی خەرەبنگ+گڵە سورە + گوڵی ژاڵە + گەڵای تەرو +رۆنی ڕەگی ترکەزی + ئاوی سرکە + ئاوی گوڵە هێرۆ +ئاردی نۆك + دۆشاوی قامیش + تەماتە مارانە + مازو بکرێت بە مەلهەم رۆژی دوو جار شوێنەکە چەور بکە.

١٣)-قنگرە کەرانە ١٠٠ غم لەگەڵا و گیاکەی + یەك لیتر ئاو بکوڵێت بە سێ ژەم بخورێت ماوەی ٧ رۆژ بەردەوام بۆ(داء الثعلب).

١٤)-هاڕاوەی قارچك + هاراوەی توێکڵی هەنار یەکی ٥٠ غم بکوڵێت + یەك پەرداخ ئاو ئەمجا لەگەڵ لۆکە بنرێ لە شوێنی گەری یەکە.

١٥)-ڕەگی گێزەر دێمی + خەیار بە ئەندازەی یەك بکوڵێت و رۆژی دوو جار بخورێت ماوەی ١٥رۆژ.

١٦)-گوڵە باخ + ڕەزلە + وەنەوشە +گوڵە تۆڵەکە یەکی ١٠٠ غم ئەمجا یەك کەوچك+یەك پەرداخ ئاو بکوڵێ و بخورێ بۆ ژەمێك رۆژێ دوو جار.

١٧)-تۆوی گیاو گوپاڵ یا (تاتورا) یان (پیزەڵ)+ تەماتە مارنە + گڵە سورە بکرێ بە مەلهەم وەك خەنەو شەو لێی بدرێ تابەیانی بۆ دەردەچرێوی موی لێ دێتەوە.

١٨)-دۆشاوی گوڵ و گوڵی دار مەڵهەم + گەڵا قەزوان + گەڵا گوێژ بکوڵێ و بە دۆشاو بۆ کەچەڵی و گەری پێی چەور بکرێ.

١٩)-تۆو گەڵای گوپاڵ +مازو + جوتر + گزگل +گڵە وسورە بە کوتراوی + دۆشاوی گوێژ یان گزیجار رۆژی دوو جار چەور بکرێ بە ئاوی سیر بشۆرێ بۆ دەردە ڕێوی .

٢٠)-دۆشاوی نارنج ٧ رۆژ پێی چەور بکرێ رۆژی دوو جار .

# نەخۆشی‌یەکانی موی سەر و جەستە

١)-لە پێشدا بە ڕۆنی بادەم موەکانی سەر چەور بکرێت دوای ماوەی سەعاتێك بە ئاوی شەلَی و پیاز و سیر سەر تەڕبکرێت دوای بەزەردێنەی هێلکە + ڕۆن زەیتون بە تێکەڵاوی سەری پێ بشۆرێت.

٢)-خواردنی ڤیتامین A. B بە هۆی ئەومیوانەی کە ئەو دوو ڤیتامینەی تێدایە.

٣)-ئەوانەی ڤیتامین A تێدایە ئەمانەن گێزەر، ماسی، گوڵی کەلەرم، پەنیر، زەردێنەی هێلکە مەنجیر، شیلم، شیر، نارنج چەوەندەر.

٤)-ئەوانەی ڤیتامین Bتێدایە پەتاتە، گێزەر، گوڵی کەلەرم، سوسێ، چەڵتوك، سرکە، گۆشت.

٥)-بە شامپۆی گوڵە هێرۆ بشۆری، گوڵە بەیبون + گوڵە هێرۆ + مۆرد + شەلَی+تووەسپون یەکی ٥٠ غم + دوو لیتر ئاو بکوڵێت یەك سەعات پاشان پێی بشۆرێ.

٦)-لاولاو گەڵاو گوڵەکەی ١٠٠ غم + وەنەوشە ١٠٠ غم + ڕازیانە ١٠٠ غم+تۆو کاهو ١٥٠ غم + یەك لیتر ئاوبکوڵێت بە سێ ژەم بخورێت موی سەر بەهێز دەکا .

٧)-ڕۆنی بادامی تاڵ یان چەقالە بدرێ لە بنی مـودا دوای سەرشتن مووی سەر بەهێز دەکات.

٨)-ڕەگی هێرۆ + گەڵای بەڕو + بەیبون یەکی ٥٠ غم + ٣ پیاڵە ئاو بکوڵێت دوای یەك پیاڵە سرکەی تێکە ئەمجا سەری پێ بشۆرە مو بەهێز دەکات.

٩)-تەنگە ژێ ڕۆژی سێ جار جاری یەك کەوچك لە هاڕاوەی گەڵا و بەرەکەی + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت زۆر بەهێزە بۆ موو ئیتر هەڵ ناوەرێ.

١٠)-قناولێ + گوڵە هێرۆ + بەیبون لە هەمویان سێ کەوچك + یەك پەرداخ ئاو دوای کوڵان سەری پێ بشۆرێ بۆ موو هەڵوەرین و بۆ موخۆر کە باشە، گەڵای بەهێ+گەڵای سێو+هەنگوین بەرگری موو هەڵوەرین دەکا.

١١)-خەنە + سرکە موی سەر بەهێز دەکا .

١٢)-مۆرد + گوڵە هێرۆ سەری پێ بشۆرێ موی سەر بەهێز دەکا بەرگری هەڵوەرین دەکا.

١٣)-زەیتو نی کاڵ بکوترێ و ئاوەکەی بگیرێ سەری پێ چەور بکرێ بەرگری موو هەڵوەرین دەکات.

١٤)–ئاوی گوڵاوی هەزبی + ئاوی گوڵاوی بەیبون سەری پێ بشۆری بەرگری‌موو هەڵ وەرین دەکات .

١٥)–مەڵوژە + کەشك بکوترێ و بنرێ لەشوێنی ڕوتاوە موی لێ دێنێتەوە هەمو شەوێ ٧ شەو لەسەر یەك.

تۆو گوێ بەرخە + بەیبون + تۆوی گوڵە هێرۆ یەکی ٥٠ غم لەسێ پەرداخ ئاو بکوڵێت سەری پێ‌ی بشرێت موی سەر بەهێز دەکا هەڵ ناوەرێ .

١٦)–هەڵوژە بێ ناوك + گەڵا بەڕو +سرکە بکرێ بەهەویر و بنرێ لە شوێنی ڕوتاوە ، موەکەی دێنێتەوە.

١٧)–پیاز + ڕەشکە یەکی ٥٠ غم بکوترێ و بکرێ بە مەڵهەم سەری بریناوی پێ چەور بکرێ (کەچەڵی) چاك دەبێ.

١٨)–بۆژانە بیکوڵێنیت ئاوەکەی کە چەڵی پێ چەور بکرێ چاکی دەکات .

١٩)–قاچکە گولانە بکوڵێت و ئاوەکەی کەچەڵی پێ چەور بکرێ چاکی دەکات .

٢٠)–گەڵابی + گوڵە هێرۆ دوو کەوچك + یەك پەرداخ بکوڵێ و سەری پێ بشۆرێ موی سەر بەهێز دەکا.

٢١)–هەرێز + گوڵە هێرۆ + مورد + بەیبون یەکی ١٠٠غم + یەك لیتر ئاو بکوڵێ و سەری‌پێ بشۆرێ موی سەر بەهێز دەکات.

٢٢)–دەموکانە گرێ یەکە بەدار مازوە وە دەروێ بیکوڵێنە دۆشاوەکەی یان شیلکەی موی چاوی ژنان(کەندە موو)لادەبات.

٢٣)–ئاوی شەمامە + توێکڵی گوێز توێکڵە سەوزەکەی بە یانیان بدرێ لە موو ڕەنگی ڕەش دەکات بۆ ڕەشکردنەوەی باشە .

## برینی میکرۆباوی و تێراوی گەڕی و گولی و بیرۆ و سەرەتانە

١)–گیا ڕکێشە + گەڵای قەزوان + گوڵە هێرۆ + بناوج + گیا مەڵهەم یەکی ٥٠ غم+یەك لیتر ئاو بە ئەندازەی یەك بیان کوڵێنە دۆشاوەکەی بۆ برینی سوداوی و بیرۆ سەری کەچەڵی پێ چەور بکرێ .

٢)–تۆو خاکەشێر (وەردینە)+ چەوری ئاژەڵ بکرێ بە مەڵهەم بۆ چەور کردنی برینی پیس و گەڕو گولی.

٣)-سورە هەڵاڵە + گەڵای ژاڵە + ڕەگی خوژیلک بە قەدەریەک بکوڵێ وەک دۆشاو بۆ چەور کردنی برینی پیس و سودلوی تێراوی زۆر باشە .

٤)-مورە گیا بیکوڵێنی وەک دۆشاو برینی پێ چەور بکرێ چاکی دەکاتەوە .

٥)-ئاوی پیازە خوگانە برینی پێ بشۆرێ و پێی چەور بکرێ چاکی دەکاتەوە .

٦)-گوێ بەرخە + گەڵا گەزنە + گوڵە ماهور + ڕازیانە بە ئەندازەی یەک ئەمجا جاری یەک کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت ئاوەکەی گول خۆی پێ بشوات چاک ئەبێ .

٧)-گوڵە گوێزوان + شیلان یەکێ ١٠٠ غم + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێ بە یەک جار بخورێ بۆ نەخۆشی پێست و برینی ئالۆش چاکی دەکاتەوە.

٨)-گیا مەڵهەم تۆو گەڵاکەی + گەڵای قەزوان + گەڵا گوێز بکوڵێ دۆشاوەکەی خەست ئەبێتەوە بۆ چەورکردنی برینی سودلوی و گەڕی بیرو گول .

٩)-گیا گوپاڵ تۆرگیا ی گەڵاکەی + ڕۆن زەیتون دوای کوڵان + خەنە یان وسمە بکرێ بە مەڵهەم بۆ برینی تێراوی صەدەفی .

١٠)-گەڵا و پێستی تەرپی بکوڵێ و بکرێ بە مەڵهەم بۆچەور کردنی برینی میکرۆباوی و سەوداوی و بیرۆ و ڕۆژی دو جار چەور بکرێ بۆ ٧ ڕۆژ.

١١)-مێخەک + توێکڵی هەنار + توێکڵی سەوزی قەریکە گوێز + خوێ بە ئەندازە + ئاو بکوڵێت ماوەی یەک سەعات بۆ هەمو برینێک .

١٢)-پیازە خوگانە بکوترێ بنرێ لە برین چارەی دەکات بخرێتە سەر دومەڵ دەرگای دەکاتەوە .

١٣)-مازو + سیچکە + گزگل + جەوت دوای کوتان و بێژانەوە + خەنە بۆ هەمو برینێک باشە.

١٤)-گەڵا وگوڵی و میوەی دار مەڵهەم + گەڵا قەزوان + گەڵا گوێز بکوڵێت خەست ئەبێتەوە بۆ هەمو برینێک و بیرۆ گەڕی و گول یەک.

١٥)-بەڕو + گزگل + سیچکە + پێستی شوتی + مازوی شین + خەنە بکوترێ+ئاو بکرێ بە مەڵهەم بۆ برینی سەرەتان و برینی شەکرە.

١٦)-گیازەنگۆڵ (بەرزە لنگ)بکوڵێت تا خەست ئەبێتەوە وەک دۆشاو بۆ برینی پیس سوداوی بیرۆ باشە پێی چەور بکرێ.

١٧)-گیانگیر (کرمە کوژە) یان شەکران +موی بزن + ڕەزلە بکوڵێت وەک دۆشاو خەست ئەبێتەوە و برینی پیسی سەرەتان و تێراوی پێ چەور بکە .

١٨)-گوڵە زەنگوڵە بکوڵێنیت بیکە بە دۆشاو + تەماتە + ئاوی رەزلە وەك مەلھەم بۆ بیرۆ و کەچەڵی و پاژنە قلیشان.

١٩)-بادام تاڵ + پێستی باینجانە رەشە +سرکە وەك مەلھەم بۆ برینی سوودلوی بە ١٠ رۆژ چاکی ئەکا.

٢٠)-بادامە تاڵە + هەنگوین بکرێ بە مەلھەم وبرینە زەردە‌ی پێ چەور بکرێ چاك دەبێتەوە.

٢١)-قامیشی شەکر دۆشاوەکەی بیگری بۆ برینی سوودلوی پێی چەور بکرێ .

٢٢)-گەڵای قامیش + پیاز بکوژێ ێ و بکرێ بە مەلھەم بۆ سەربرین .

٢٣)-گوێزوانە کێویلە دۆشاوی بیگرە بە کوڵاندن بۆ برینی سوودلوی .

٢٤)-یەك کفم پرتەقاڵ + یەك کفم خەیار بکوڵێنیت دوای پاڵاوتن ئاوەکەی بدرێ لە برینی سوودلوی و تیراوی چاك دەبێتەوە.

٢٥)-سمڵ یان (گیا بیرۆ) بھاڕیت و بکوڵێنیت و دۆشاوەکەی بیگرێ بۆ بیرۆ و برین پێی چەور بکرێ باشە.

٢٦)-کاڵەکە مارانە (گوژلك)+ هەزیی + پەیکوڵ لە هەموی یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێنیت بۆ ژەمێ رۆژی دوو جار ماوەی رۆژ بۆ سوودلوی بخورێت.

٢٧)-هەلای هەڵ (مار کوژە)+ ماست بکرێ بە مەلھەم بۆ سەربرین و سوودلوی تیراوی و گەری.

٢٨)-توێکڵی شوتی بکوترێ + ئاوی لیمۆ وەك مەلھەم بۆ سەربرینی پیس میکرۆباوی پێی چەور بکرێ.

٢٩)-زەڵ + درکە زەردە + گیا مەلھەم + رەگی درکەزی +تەرسی ئەسپ بە ئەندازەیەك بکوڵێنیت وەك دۆشاو+ گڵە سورە بۆ برینی پیس و میکرۆباوی و گوڵی تیراوێ پێی چەور بکرێت دوای ٥ سەعات برینەکە ئەشۆرێ رۆژی دو جار.

٣٠)-گیامشك دار گەڵاو گوڵی ئەم گیایە مەلھەمی لێ دروست دەکرێت بۆ برینی میکرۆباوی و سوودلوی و بیرۆ پێی چەور ئەکەی؟ گوڵە کەرکەب + رۆنی بادەم وەك مەلھەم دۆشاوەکەی بدرێ لە برینی میکرۆباوی کە ئیلتھاب و جەراعەتی هەبێ شیرەسك (شفتەزێ) دۆشاو دەگیرێ + رۆنی ئاژەڵ بکرێ بە مەلھەم بۆ گوڵی سوودای تیراوی وەمیکرۆباوی.

٣١)-وەسمە + سیسرگ یان قالۆنچە ڕەشە تێکەڵ بکرێت بۆ سەر برینی سەوداوی تێراوی چەور بکرێت .

٣٢)-مرۆر + بیبون + ڕەگی گۆزروان + گەڵا گوێز بکوڵێت و بکرێت بەدۆشاو بۆ برینی گوڵی سوداوی و تێراوی چەور بکرێت.

٣٣)-دار خەڵات (گوڵی ڕەشە دەرمان)+ گیا مەلهەم + گیا ڕکێشە بو کوڵاندن بکرێ بە دۆشاو بۆ برینی گوڵی سوداوی و تێراوی چەوربکرێ.

٣٤)-کالور دۆشاوی لێ دروست دەکرێ بۆ برینی گولی و سەوداوی تێراوی.

٣٥)-بەیبون + پونگە + تەماتە مارانە + گەڵا گوێز دۆشاوی بیگیرێ و بکرێ بە مەلهەم برینی پیس تێراوی و گەروی سەوداوی و گولی پێ چەور بکرێ .

٣٦)-بەری شیرە گیا + گیا مەلهەم + بەیبون + گوزروان + گەڵا گوێز + ڕەگی درکەزی یەکی ٢٥٠ غم + ٥ لیتر ئاو سێ سەعات بکوڵێ ئەمجا دای بگرە بی پاڵێوە + ڕەشکە+ڕۆنی زەیتون بیکوڵێنە تا دەبێ بە دۆشاو بۆ هەمو برینێکی پیس و سەرەتانی ڕۆژی دووجار.

٣٧)-گوڵی ژاڵە + گیای مێش گرە +ماست بکرێ بە مەلهەم بۆ گەڕی و سەوداوی تێراوی بیرۆ.

٣٨)توتن + ڕۆنی ئاژەڵ بکرێ بە مەلهەم بۆ برینی پیس و گەڕی .

٣٩)-مار کوژە ئاوەکەی بگیرێ برینێ تێراوی سوداوی چاك دەکات .

٤٠)-گیا کەڵە + سرکە بۆ سەر برینی سەوداوی گەڕی و بیرۆ زۆر باشە .

٤١)-ڕەگی درکە زی + توتن دوای کوڵان وەك دۆشاو خەست بێتەوە بۆ برینی مێکرۆباوی و گەڕی و بیرۆ.

٤٢)-تەماتە جنانی ٥ دانە + هەزبی ٢٠ غم + ڕازیانە ٢٠غم+قەیتەران ٢٠ غم+دوو پەرداخ ئاو بکوڵێت بۆ یەك جار بخورێت ڕۆژی دوو جار ماوەی ٧ ڕۆژ.

٤٣)-ئاوکی هەڵوژە بە کوترەوای بسوتێ + ڕۆنی کونجی بکرێ بە مەلهەم بۆ برینی سوداوی تێراوی بیرۆ ی پێ چەور بکرێ.

٤٤)-مازو + گزگل + سیچکە + جەوت + تونکڵی شوتی + تونکڵی هەنار بیان هارە+خەنە وەك مەلهەم بدرێ لە برینە ڕەشە (گنگری) ٧ شەو لێی بدرێ چارەی دەکات.

## مایەسیری تەڕو ووشك

١)-تۆو توتن + زەردەچەوە بیان کوتە + شیری خشخاش +زەردێنەی هێلکە بیکە بە شاف بۆ مایەسیری شەو یەك دانە ٥ شەو.

٢)-هەنجیری سەوز بە کوترواى + ئاوی دۆشاوی توێکڵی فەریکە گوێز شافی لێ دروست بکە شەوی یەك دانە ٤ شەو.

٣)-قازی ئاغا +گەزنە + تۆزی خوێ بیان کوتە و شافی لێ دروست بکە شەوی یەك شاف ماوەی ٥ شەو بۆ مایەسیری تەڕ باشە.

٤)-تۆو توتن + تۆو تەڕو بە کوتروای شافی لێ دروست بکە شەووی یەك شاف ماوەی دوو سەعات پێوەی بێ ٤ شەو چاك دەبێ.

٥)-گوڵی چنارە کەڵە + بەزی ئاژەڵ بکوترێ و بکرێ بە شاف شەوی یەك شاف دوو سەعات پێوەی بێ بە دوو شەو چاك دەبێ.

٦)-سیر + ڕەشکە + تۆزێ خوێ بیان کوتە + سرکە بیکە بە شاف شەوی یەك شاف بۆ دوگمەی مایەسیری ٤ شەو.

٧)-بەرزە لنگ (زەنگۆڵ)+ ڕەزلە (تەماتە مارانە)بکوترێ و بکرێ بە شاف شەوی یەك شاف سێ شەو بەکار بێ.

٨)-شیلەی گنگرە کەرانە شافی لێ دروست بکەیت باشترین دەرمانی مایەسیری تەڕو وشکە.

٩)-تۆوی گوژاڵك بیکولێنی لە ئاوە کولاوەکو + ئاردی نۆك شاف دروست بکرێ بۆ مایەسیری شەوی یەك دانە ٥ شەو.

١٠)-٥٠ غم گنگرە کەرانە + ٢ پەرداخ ئاو بکولێت ئاوەکەی بەیانی و ئێواران بخورێ بۆ مایەسیری باشە.

١١)-دڕکە کەوە شافی لێدروست دەکرێ بۆ مایەسیری .

١٢)-شەو بۆی زەرد گەڵا گوڵەکەی شافی لێ دروست دەکرێ بۆ مایەسیری تەڕو وشك شەوی یەك دانە.

١٣)-کەوە گیا (کەولە گیا) گەڵاکەی + تۆوی خەیار بکوترێ و بکرێ بە شاف بۆ مایەسیری شەوی یەك دانە چەند جارێك بەکار بێت.

١٤)-گیا مایەسیری (کەوڵە گاوانە) بکوڵێت لە ئاوەکەی شافی لێ دروست بکرێ بۆ مایەسیری شەوی یەک دانە چەند شەوێک بەکار بێت.

١٥)-ڕۆنی کونجی + ئاردی جۆ بکرێ بە شاف شەوی یەکدانە ٥ شەو بۆ مایەسیری .

١٦)-گیاکەڵە +سرکە بکرێ بە شاف شەوی یەک دانە سێ شەو.

١٧)-گیا ڕکێشە + گوێزدوان + هەنجیری سەوز بهاڕێت یەکی ٥٠ غم + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێ لە دۆشاوەکەی شافی لێ دروست بکە بۆ مایەسیری .

١٨)-دۆشاوی چنارەکەڵە + بەزی بزن شافی لێ دروست بکە بۆ مایەسیری جاری دوو سەعات پێوەی بێ ماوەی ٥ شەو چاک ئەبێ.

١٩)-دۆشاوی گوڵە خەنازیل بیکە بە شاف بۆ مایەسیری .

٢٠)-سالمە ٥٠ غم + ڕۆنی گوێز ٥٠ غم بە دوو جار بخورێ لە ڕۆژێکدا بۆ مایەسیری ٧ ڕۆژ بەکار بێت.

٢١)-١٠٠ غم بەلاڵوك + ٥٠ غم ڕۆنی ئاژەڵ بە دوو جار بخورێ بۆ مایەسیری ٥ ڕۆژ بەکار بێ.

٢٢)-بنێشتە تاڵە + سابونی ڕەقی + پیاز بدرێ لە دومەڵی ناسور چارەی دەکا ئەمجا دوای بە ئاوی لیمۆی ترش بشۆرێ .

٢٣)-گوڵە هێرۆ + گوڵە ئەرمەنی + گیا ڕکێشە + ئاردی جۆ بە نیو نمەك (دەستە ئەرمە)بدرێ لە ناسورە شەو پاکی دەکاتەوە.

٢٤)-هەنجیری کاڵ + توێکڵی گێزەر بهاڕێ و شافی لێ دروست بکرێ بۆ مایەسیری تەڕ شەوی یەک شاف ٥ شەو لەسەر یەك .

٢٥)-هەزبی + پیاز + پونگە + قازی ئاغا +تۆوی شەکر بیان هاڕە + سابونی ڕەقی بکرێ بە شاف شەوی یەک دانە ٧ شەو بۆ مایەسیری ووشك .

٢٦)-قەیتەران + بەیبون +گەزنە + نەعنا + گەڵا گوێز ١٥٠ غم ئەمجا جاری یەك پیاڵە + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێ و بخورێ بۆ پاککردنەوەی خوێنی پیسی لە مایەسیری .

٢٧)-تۆوی تەڕ بی + تۆو توتن بکوترێ و شافی لێ دروست بکەی بۆ مایەسیری چارەی دەکات.

٢٨)-مێوە یان تۆوی سنجو یان (سنرچکە) بێ ناوکەکەی + ڕەگی بناوە تۆم بکرێ بە شاف لەگەڵ بەزی بزن شەوی یەک دانە بۆ ٧ شەو بۆ ووشکە مایەسیری.

٢٩)-گەزنە + قازی ئاغا + تۆزی خوێ بکرێ بە شاف ئەتوانی گەزنە +دۆشاوی تونکلی سەوزی گوێز بکرێ بە شاف شەوی یەک دانە ٤ شەو بۆ ووشکە مایەسیری.

٣٠)-خەنە + ڕۆن زەیتون بکرێ بە شاف شەوی یەک دانە بە خۆی هەڵگری ٥ شەو بۆ مایەسیری.

٣١)-جەوت + پێستی گەدەی مەر (کلاو قازی بهارێ) بیێژرێتەوە و بدرێ لە کۆمی دەرهاتوو ڕۆژی سێ جار دەچێتەوە ناوەوە و چاك دەبێ.

٣٢)-هەنجیری ووشك ١٠٠ غم ٤ شەو بکرێتە ئاو بەیانیان بە ناشتا هەموی بخورێت ژانو بای مایەسیری چارە دەکات.

# دومەڵ و زیبکەبرین و پەڵە

١)-توو کاهو +ترشە سماق یەکی ١٠٠ غم + ١,٥ لیتر ئاو بکوڵێت ٣ ژەم ژەمی ١ پیا لە بخوات بۆ دو مەڵ و زیبکە.

٢)-ئاوی لیمۆ ٥٠ سی سی +٢٥سی سی هەنگوین بە تێکەڵاوی دەم و چاوی پێ بشۆرێ شەوو بە یا نی بیشۆ زیبکە نامێنێ.

٣)-ئاردی پونگە +ئاردی نۆك +ئاردی هەزبێ +ئاوی لیمۆ +سرکە وەکو مەلهەم زیبکەی پێ چەوربکرێ چاك دەبێ.

٤)-رۆنی بەیبون + هەنگوین بۆ زیبکە و دومەڵ و برین باشە .

٥)-هاراوەی گوڵە سورە + هاڕاوەی ڕەشکە + ئاردی جۆ وەك نوێ نەەك بۆ سەر دومەڵە ڕەش دەرگای ئەکات.

٦)-گەڵای قومام +دۆکە زەردە بیان کوتە بیان خەرە سەر دومەڵ دەرگای ئەکاتەوە .

٧)-ڕۆن بادەم +هەنگوین بۆ برین پێ ی چەوربکرێ چاك دەبێ.

٨)-گیای گوڵە زاوا+پیازە مشکانە بکوترێ + سرکە وەك مەلهەم برینی پیسی پێ تەداوی بکە یا وەك نیو نەەك لێ ی بنێ بۆ ژانەوبنایێ بخورێ دوای کوڵان برینی پیس پێ تەداوی دەکرێ.

٩)-گوڵە هێرۆ بکوڵێت ئاوەکەی برینی پیسی پێ تەداوی دەکرێ .

١٠)-دۆشاوی بەیبون دەم و چاوی پێ بشۆرێ زیبکە لادەبا برینی پێ بشۆرێ چاکی دەکات.

١١)-گوڵە داودی + شیر بکوڵێنێت پەڵە و زیبکەی دەم و چاو لادەبات .

١٢)-شاتەرە بکوڵێت و بخورێتەوە بۆ لابردنی پەڵە، چاك بونی برین بۆ (برص) زۆر باشە .

١٣)-تونکڵی شوتی + لیمۆی ترش بکوڵێت بۆ تداوی برین .

١٤)-گوڵە ئاو یان (گوڵە کێوی) بکوڵێت بۆ تداوی برین.

١٥)-گیای مشك داو بکوڵێت وتداوی برینی پێ بکرێت.

١٦)-دەموکە تۆزێ گەرم بکرێ بخرێتە سەر دومەڵ دەرگای دەکات .

١٧)ئاردی پاقلە + ئاردی نۆك + چەوری ئاژەڵ وەکو نیو نەمك بۆ سەر دومەڵ .

١٨)-رەگی گوڵە شلێرە + سەلکی نێرگس بکوترێ و بنرێ لە دومەڵ دەرگای دەکاتەوە .

١٩)-رەگی گوڵە شلێرە +ئاردی جۆ + رۆنی زەیتون بکرێ بە نیو نەمك بۆ سەر دومەڵ دەرگای دەکاتەوە .

٢٠)-گوڵە دیاری یەك کفم + رەگی رکێشە یەك کفم + کنیوال یەك کفم + ترشە سماق یەككفم + ٥ لیتر ئاو بکوڵێت وەك دۆشاو خەست ببێتەوە بۆ تداوی برین .

٢١)-وسمە +مەرگە موش بۆ تداوی برینە زەردە .

٢٢)-کەتان + ئاردی جۆ +رۆن کونجی وەك نیونەمك بۆ سەربرین و دومەڵ و بۆ غودە و جراعەتەکە رادەکێشێ .

٢٣)-توتن + رۆنی ئاژەڵ بۆ تداوی برین، توتن +شەکر وەك نیو نەمەک بۆ سەر دومەڵ .

٢٤)-گەڵا رکێشە بە کوتروای بۆ سەر دومەڵ برینی پیس جراعەتەکە رادەکێشێ .

٢٥)-گوڵی لالو عەباس ٥٠ غم + گوڵی تۆلەکە ٥٠ غم + گوڵی نیلوفەر ١٠٠ غم دوو کەوچك+یەك پەرداخ ئاو دوای کوڵان بخورێت رۆژی دو جار بۆ زیبکەی دەم و چاو .

٢٦)-گیای هەنگ بەر یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت رۆژی سێ جار بۆ زیبکەی دەمو چاو.

٢٧)-تاقە گوڵ + شاتەرە دوو جار دوو کەوچك لە هەردوکیان + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت رۆژی سێ جار بۆ لابردنی زیبکەو پەڵەی دەم و چاو .

٢٨)-گەڵا گوێز + قازی ئاغا بکوڵێت جاری یەك پیاڵە بخورێت سێ ژەم بۆ لابردنی پەڵەو زیبکە.

٢٩)-رەگی تویسی + رۆن کونجی بکری بە مەڵهەم دەم وچاوی پێ چەور بکری پەڵەی دەم و چاو لادەبات زۆر باشە .

٣٠)-گەڵای خەرنو (دەرمانە لەرزە) + گوڵە هێرۆ وەک نیو نەمەک بۆسەر دومەڵ دەرگای دەکاتەوە

٣١)-پیازە گوڵانە + زەنجەفیل + ملل ئزرق جاری یەک غم بکرێ بە حەب رۆژی سێ حەب بە سێ ژەم بۆ لابردنی پەڵەی زیبکە.

٣٢)-گوڵ کاوریان (گوڵە کێوی گەڵاکەی بکوترێ وەک نیونەمەک بۆ سەر برینی پیس و جەراعەت چاکی دەکاتەوە).

٣٣)-قازی ئاغا بە وشکی یەک پیاڵە + ١,٥ پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت بۆماوەی ٤٠ رۆژ بۆ پەڵە(برص)ئەگەر بەهاران بە تەڕی بخورێ رۆژی ٥ غم بخوات .

٣٤)-قازی ئاغا بکوترێ +خەنە وەک مەلهەم پێ‌ی چەور بکرێ بۆ پەڵەی سپی بۆ ماوەیەک چارە سەر دەکرێ.

٣٥)-مازو + گزگل بە ئەندازە بیهاڕە + خەنە بیکە بە مەلهەم بۆ برینە زەردە بە دوو جار چاک دەبێ.

٣٦)-مازو + سیچکە + جەوت + گزگل بهاڕێ و بیبێژرێ + خەنە بکرێ بە مەلهەم برینە زەردەی پێ چەور بکە چاک دەبێ بۆ برینی سەرما بردەش باشە.

٣٧)-مازو + درکە زەردە + خەنە بکرێ بە مەلهەم برینە زەردەی پێ چەور بکە چارەی دەکات.

٣٨)-هەزبی + سرکە بکرێ بە نیو نەمەک بۆ سەر زیبکە شەو پێوەی بێ چاکی دەکات .

٣٩)-گەڵا بی + گەڵا گوێزی سەوز بخرێتە سەر زیبکە شەو پێوەی بێ چاکی دەکات .

٤٠)-گەڵای پونگە + هەزبی + خەریەنگ بنرێ لە شوێنی زیبکەیەک کە بخورێ و ئاڵۆش ئەبێ چارەی دەکا.

٤١)-بۆ قڵیشانی لێو ئەم مادانە بخۆن زۆر وەک ئاوی هەنار ئاوی سرکە کاهو گەڵای چەوەندەر ئاوی جۆ بۆ ماوەی سێ رۆژ.

٤٢)-شیلان - گوڵی گوڵەزەردان یەکی ١٠٠ غم + یەک لیتر ئاو بکوڵێت رۆژی دو جار ئاوەکەی بخورێت بۆ ١٢ رۆژ بۆ پەڵە باشە

## گرانەتا و مەلاریا و سورێژە و ئاولە و لەرزوتا

١)- ٥٠٠غم سیر + ٥٠٠غم رەشکە + ١٠٠ غم بیبەر +٢لیتر ئاوبکولێنێ جاری ١پیاڵە رۆژی ٣جار ماوەی ٣رۆژ بخورێت بۆ گرانەتا پێش نان بخورێت.

٢)- نەعنا + هەزبی +گوڵی پونگە جاری دو کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکولێت و بخورێت پێش نان ماوەی ٥ رۆژ چاك دەبێ بۆ گرانەتا .

٣)- گەلا بی + رازیانە پاش کولاندن سێ ژەم بخورێت بۆ گرانەتا و لە رزوتا.

٤)- گەڵای ئەرخەوان + پێستێکی تەنك لە ژێر توێکڵەکەوەیەتی + پەیکوڵ ژەمی دوو کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکولێت و بخورێت بۆ ١٥ رۆژ مەلاریا.

٥)- لە پێستی درەختی شۆرەبی ئەسپرین دروست کراوە بۆ چارەسەری مەلاریا .

٦)- گەڵای ئەرخەوان یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکولێت و بخورێت سێ ژەم ماوەی ٧ رۆژ بۆ سێ بەرۆ لەرزو تا و مەلاریا.

٧)- گوڵی لالو عەباس + تۆڵەکە + نیلوفەر + گەلا بی دوو کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکولێت و بخورێت سێ ژەم بۆ گرانەتا و مەلاریا و لەرزوتا .

٨)- خەرنو (دەرمانە لەرزە)+ هەزبی + رازیانە یەکی ١٠ غم + یەك پەرداخ ئاو بکولێت و بخورێت بە ژەمێك رۆژی سێ جار بۆ لەرزو تارسێ بەرۆ و مەلاریا .

٩)- تەماکو جنانی + هەزبی لە هەردوکیان یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکولێت بۆ ژەمێك رۆژی دووجار ماوەی ٥ رۆژ بۆ سورێژە و ئاولە .

١٠)- حوشتر خۆرە یەك مسقال + یەك پەرداخ ئاوی سارد یان یەك پیاڵە بدرێ بە منداڵ بۆ سورێژە و ئاولە.

١١)- گیا رکێشە + گیای گوێزوان بیان کولە و بیخەرە سەر دومەڵ و دەرگای ئەکات و جراعەتەکەی رادەکێشێ .

١٢)- گەلا بی + گەڵای سورە چنار + گەلا هەڵوژە دوو کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکولێت و بخورێت بە جارێك رۆژی دوو جار بەکار بێت بۆ مەلاریا

١٣)- کەتیرەی زەرد جاری ٢٠ غم + یەك پەرداخ ئاو بکولێت و بخورێت ماوەی ١٥ رۆژ بۆ مەلاریا و ئاولە.

١٤)- ١٠ غم گەزۆ + ١٠ غم ڕازیانە + یەك پەرداخ ئاو بخورێت ڕۆژی سێ جار بەکار بێت بۆ سوورێژەو ئاوڵە.

١٥)- بەڵەك ڕەگەکەی بیمارە جاری دوو کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت بە سێ جا لە ڕۆژێکدا بخورێتەوە ماوەی ٥ ڕۆژ بۆ سوورێژە.

١٦)- ڕازیانە + زنیان + هەزبی + نەعنا + تونێکلی هەنار یەکی ١٠٠غم ئەمجا یەك کەوچك+یەك پەرداخ ئاو بکوڵێ و بخورێ سێ ڕۆژ چارەی تاعون و کولێرا دەکات.

١٧)- ڕازیانە + زیرە + زنیان + هەزبی یەکی ١٠٠ غم ئەمجا یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێ و ڕۆژی یەك جار بخورێ بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بۆ تاعون .

١٨)- تعقیم کردنی ئاو ماڵ بە سوتاندنی یەکێ لەم مادانە یان گوگرد یان گەڵا ژاڵە یان گەڵا تەربی یان تۆو خەرێەن دوکەڵەکەی بچێ بە ناو ماڵدا نابێ بچێتە ناو هەناسەی مرۆڤ چونکە ژاهراویە.

١٩)- ڕەگی بەڵەك + گەزنە + ڕازیانە بهارێ جاری یەك کەوچك + ٥ پەرداخ ئاو بکوڵێ و بخورێ لە ماوەی یەك سەعات دا ماوەی ٥ ڕۆژ بۆ سوورێژەو و ئاوڵە.

## زیرەکی بیر و هۆش و بیر تیژی

١)- سەلکی کنێوال +گوڵی تۆلەکە دوو کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت بۆ ژەمێك ڕۆژی دوو جار بخورێت بۆ بیر تیژی .

٢)- گوڵە دەوری (دەرمانە ئازار) یەك کەوچك چێشت بۆگەورە یەك کەوچك چا بۆ منداڵ + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بۆ بیر تیژی و گەشکە.

٣)- بادامی شیرین + ڕۆنی کونجی + ئاوکی قەیسی تێکەڵاو بکرێ لە هەمویان ژەمی دوو کەوچك بۆ بیر تیژی بۆهۆش و بیر باشە .

٤)- تۆوی ئاوگ +مەزنە جۆش ژەمی یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت ڕۆژی دوو جار ٥ ڕۆژ بۆ هۆش و بیر.

٥)- گوڵە سەوسەن ١٠٠ غم + یەك کفم هەنگوین سێ ژەم دوو کەوچك بخورێت ماوەی ٥ ڕۆژ بیرو هۆش بە هێز دەکا.

٦)- گێلاس + گوێز + بادەم ژەمی ١٥٠ غم سێ ژەم بۆ بە هێزی بیر و هۆش ..

٧)–سالمە + رۆن کونجی + رۆنی گوێز یەکی ١٠٠ غم جاری یەك کەوچکی چێشت لێ بخورێ بیرو هۆشی مرۆڤ بەهێز دەکا.

٨)ترێ ئاوەکەی مێشك و بیرو هۆش بەهێز دەکا .

٩)–گەڵا پەلم ٢٠ غم لەگەڵا و ساقی ئەم رووەکە + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت بەیەك جار بۆ بیرو هۆش زۆر باشە.

١٠)–ئەومادانەی وەك مس و فسفور لە گوێز و کونجی دا هەیە لەگەڵ هەندێك گوڵ و گیا و رووەکی تر بۆ بیرو هۆشی مێشك زۆر باشە .

## هەساسیەت (ئاڵۆش)

١)–گەڵای پونگە + تۆزێ خوێ بکوڵێت و خوی پێ بشۆرێت بۆ حەساسیەت بۆ ئاڵۆشی پێست.

٢)–گیا زەنکۆلە (بەرزە لنك) + پونگە + تۆزێ خوێ بکوڵێت و خوی پێ بشۆرێت بۆ ئاڵۆش و زیبکە و لیر زۆر باشە.

٣)–بەری تەماتە مازانە ١٠ دانە + تۆو گێزەر یەك کەوچك + ١٠٠ غم هەنگوین تێکەڵاو بکرێ رۆژی سێ جار جاری یەککەوچك بخورێت و بۆ حەساسیەتی خوێن و پێست .

٤)–گوڵ و گیای بۆژانە ١٠٠ غم + دوو لیتر ئاو بکوڵێت خۆتی پێ بشۆرە بۆ ئاڵۆشی پێست.

٥)–بۆ ژانە گوڵ سپی بکوڵێت دوایی خۆتی پێ بشۆرە بۆ پێست وە بۆ برین پێی بشۆ چاك دەبێ؟میکرۆب کوژە .

٦)–گوێزوانە کێویلە (گیا ئاڵۆش) بکوڵێت بە ئاوەکەی خۆی پێ بشۆرێ ئەتوانی جاری تۆزێکیشی لێ بخۆیت بۆ ئاڵۆشی پێست .

٧)–گوڵ داودی (گوڵە پایزە)+گوڵی رێواس یەکی ١٠٠ غم + یەك لیترئاو بکوڵێت و خۆتی پێ بشۆرە بۆ ئاڵۆشی پێست.

٨)–گوڵی ئاو یان (گوڵە کێوی) بکوڵێت و خۆتی پێ بشۆرێت بۆ ئاڵۆشی پێست و برین زۆر باشە.

٩)–گەڵا کالبتۆس + گەڵا بی بکوڵێت و خۆتی پێ بشۆرە خورو ئاڵۆش نامێنێ .

١٠)-شاتەرە (خوێن پاڵێو) + چەقچەقە یەکی ١٠٠ غم بکوڵێت و بخورێتەوە لە ڕۆژێکدا بۆ ئاڵۆش و حەساسیەتی پێست و خوێن .

١١)-لاولاو +گوڵە هێرۆ + گوڵە نیلو فەر یەکی ١٠٠ غم + یەك لیترئاو بکوڵێت ژەمی یەك پەرداخ ڕۆژی سێ جار بۆ ئاڵۆشی پێست ماوەی ٣ ڕۆژ .

١٢)-گیا مایەسیری (ڕەزڵەگاوانە) بکوڵێت و خۆی پێ بشۆرێ بۆ ئاڵۆشی پێست .

١٣)-گیا شیرە گیا + ڕەزڵەمارانە + بەنەوشە + بەیبون + دوو لیتر ئاو دەرمانەکان یەکی ١٠٠ غم دوای کوڵان خۆتی پی بشۆرە بۆ ئاڵۆشی پێست .

١٤)-گوڵی ئالۆ عەباس + تۆڵەکە + گەڵا بی + گوڵی نیلو فەر یەکی ١٠٠ غم + یەك لیتر ئاو بکوڵێت ڕۆژی سێ جار جاری یەك پەرداخ بخورێتەوە ئاڵۆش لا دەبات.

١٥)-هەنگ بەر یەك کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت سێ ژەم بۆ ئاڵۆش .

١٦)-تاقە گوڵ + شاتەرە دوو کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت ڕۆژی سێ جار بۆ ئاڵۆشی پێست .

١٧)-گەڵای قۆخ بکوڵێت و خۆتی پێ بشۆرە بۆ حەساسیەتی پێست .

١٨)-گیا مار کوژە بکوڵێت و خۆتی پی بشۆرە بۆ ئاڵۆشی پێست و گەڕی باشە .

١٩)-ڕەگی گێزەر دێمی بخورێت بۆ ئاڵۆش و خوراندن باشە .

٢٠)-گوڵە باخ + ڕەزڵە +وەنەوشە + گوڵە تۆڵەکە یەکی ٣٠٠ غم تێکەڵ ئەمجا دوو کەوچك+یەك پەرداخ ئاوبکوڵێت و بخورێ بۆ هەموو حەساسیەت و ئاڵۆشێك .

٢١)-تۆوە وەردێنە + گوڵی تۆڵەکە بکوترێ و بکرێتە ناو شیر بۆ حەساسیەت و ئاڵۆشی گیان و چاو/پێست باشە .

٢٢)-شیلان + گوڵە گوڕوان یەکی ١٠٠ غم+یەك پەرداخ ئاو بکوڵێ بە جاری بخورێ بۆ نەخۆشی پێست و گوڵی باشە.

٢٣)-پونگە ٥٠ غم + بەیبون ٥٠غم+ هەزبی ٣٠ غم + یەك لیتر ئاو بکوڵێ بە سێ جار بە ناشتا بخورێتەوە بۆ خواردن و حەساسیە تی پێست و گیان وە بەم دەرمانەش خۆی بشوات و پێ چەور بکات .

٢٤)-پونگە ١٠٠ غم + ٥ سەلك سیر + بیبەر ٥ دانە + خوێ ٢ کەوچك + ٢ لیتر ئاو بکوڵێ و سارد بێتەوە .

## پێوەدانی مارو دووپشك و جانەوەر

١)-گیای قومام بکوڵێت دۆشاوەکەی خەست ببێتەوە وە شوێنی پێوەدانەکەی پێ چەور بکرێ.

٢)-بەردە گیا (بۆ ماران) + گەڵای داربەن + گیا ڕکێشە بکوڵێت دۆشاوەکەی خەست ببێتەوە بۆ شوێنی پێوەدان و و برین و ئاوساوی .

٣)-سێوە خوگانە + قومام + ڕەزڵە مارانە بکوڵێت دۆشاوەکەی بکرێ بە حب لەگەڵ ئارد ژەمی بەقەدەر یەك نۆك بخوات ڕۆژی سێ(حبە)ژەمەر لە خوێندا لادەبات .

٤)-گیانگیر (کرمە کوژە)+ گوڵی ئەرمەنی بکوڵێت دۆشاوە خەستەکەی برینی ماران گەز و پێوەدانی جانەوەر ئاوساوی یەکەی و ژارەکەی چاك دەکا .

٥)-تۆوی تەرو (تەر بی) بیهارە و بیکوڵێنە دۆشاوەکەی بدە لە شوێنی پێوەدانەکەیان بەرشکی تۆزێ تەری بکەو لێیی بدە چاك دەبێ بیکەی بە سەرماردا کوژی دەکات.

٦)-ترکە کەوە + ترکە بولینە بهاڕێ وەك ئارد + سرکە بکرێ بە نیو نەمەك بۆ سەر شوێنی پێوەدان و برین چاك دەکات.

٧)-لاولاوی کێوی + ترکە زەردە بیهارە + ڕۆنی ئاژەڵ بکرێ بە مەڵهەم بۆ شوێنی پێوەدان چارە دەکات.

٨)-گیا دووپشك (مراد)بکوترێ و بنرێ لە شوێنی پێوەدان ئاوساوی نایەڵێ ئازارو پیسی دەکوژێ.

٩)-گیا ماران گەز (گیا جیوە) شیری ئەم گیایە دەدرێ لە شوێنی پێوەدانەکەی چارەی دەکا بۆ هیچ برینێك بەکار نایەت چونکە زۆر ژەهراویە.

١٠)-گەڵای ژاڵە + ڕەشکە بکوترێ و بنرێ لە شوێن دەمی پێوەدانەکە ئازارو ئاوساوی و ژەهری چاك دەکا و نامێنێ.

١١)-گەڵای ژاڵە + نەعنا یان پونگە بیان کوتی وەك نیو نەمەك بۆ شوێنی پێوەدان چاکی دەکا ئازارو وئاوساوی نایەڵێ.

١٢)-گیا گوێ مشکە بکوترێ و بنرێ لە شوێن دەمی پێوەدانەکەی ئاوساوی و ئازاری ژاردکە نا یێڵێ

١٢)-رەگی مومخلیصە دوای وشك كردنەوە و پاكردنی پێستە رەشەكە دەی هاڕن جاری یەك كەوچك + یەك پەرداخ شیر + شەكر دەدرێ بە پێوەدارەكە و ژەهرەكە لا دەبات .

١٣)-گوێزەوان ٥٠ غم لە رەگەكەی یان گوڵەكەی بهارێت بكرێتە ناو + یەك پەرداخ ئاو بكوڵێ دوای پاڵێ دراوەكە بیخوات رۆژی سێ جار بۆ سێ رۆژ.

١٤)-سیر + سركە + رۆنی ئاژەڵی بكرێ بە مەلهەم شوێنی پێوەدانەكەی پێ چەور بكرێ ژارە و ئازارەكەی دەكوژێ.

١٥)-گەزنە + نەعنا + ئاردی جۆ بیان كوتەو بیان خەسەر جێ دەمی سەگ (شوێنی گەلبەكەی) رۆژی دوو جار بۆ ماوەی سێ رۆژ چاك دەبێ وە پیازو ئاوی پیازیش بدرێ بە نەخۆشە سەگ گرتووە كە چاك دەبێ .

١٦)-ئاوی توو +ئاوی پیاز بدرێ بەو كەوسەی گرتویەتی زۆر باشە.

# دەرمان بۆ لەناو بردنی كرم و جۆرەكانی

١)-كنیوال + رۆنی ئاژەڵ بخورێت كرمی گەدەو ریخۆڵە دەكوژێ ، دەرمانە كرم ئەگەر بە ناشتا بخورێت باشترە كاریگەرترە.

٢)-پیچك + رەشكە + بەیبون یەكی ٣٠ غم بكوڵێت + ٠,٥ لیتر ئاو بۆمنداڵ ، بۆگەورە ٢-٣ پیاڵە رۆژی سێ جار كرمی گەدەو ریخۆڵە دەكوژێ .

٣)-گیا زەنگۆڵە (بەرزە لینگ) یەك كەوچك + یەك پەرداخ ئاو بكوڵێت هەمو كرمەكانی دەككوژێ.

٤)-بۆ مادران (بەردە گیا) یەك كەوچك + یەك پەرداخ ئاو بكوڵێت رۆژی سێ جار سێ رۆژ بخورێت كرم دەكوژێ و تۆوەكەی یان گوڵەكەی .

٥)-هاز ١٠٠غم + یەك لیتر ئاو بكوڵێت + یەك پیاڵە سركە سێ ژەم یەك پەرداخ بخوات دوو رۆژ .

٦)-تەمكە ژێ یەك كەوچك + یەك پەرداخ ئاو بكوڵێت رۆژی سێ جار بخورێت كرم لە ناو دەبات.

٧)-٢٥٠ غم ئاركە كولەكە + دوو كەوچك شەكر شەوكاتی خەوتن بخورێت كرم دەكوژێ.

٨)-گوژاڵك (كاڵەكە مارانە) ئیواری یەك دانە بكە ناو پەرداخی ئاو بەوردكراوی بەیانی ئاوەكە بپاڵێوە و بیخۆ كرمەكان دەكوژێ.

٩)-تۆوی کەمای زەرد + ڕازیانە یەکی ٥٠ غم + یەک لیتر ئاو بکوڵێت بەڕۆژێک بە سێ ژەم بخورێتەوە کرمەکان دەکوژێ.

١٠)-گوڵە بەیبون + تۆو شێلم یەکی ٥٠ غم + یەک پەرداخەئاو دوای کوڵان بخورێت ڕۆژی سێ جار بەکار بێت کرمی ئەسکارس دەکوژێ .

١١)-پسل ١٠٠ غم + سێ پەرداخ ئاو بکوڵێت بە ڕۆژێک بە سێ ژەم بخورێت ٥-٧ ڕۆژ بەکار بێت کرم دەکوژێ.

١٢)-گیا و گوڵی گوێ بەرخە + بەیبون یەکی ٥٠ غم + سێ پەرداخ ئاو بە سێ ژەم لە ڕۆژێکدا بخورێ هەموکرمێکی ناوسک دەکوژێ .

١٣)-بەلاڵوک وەک چا بکوڵێت و بخورێ بەیانیان بە ناشتا کرمی ناوسک لا دەبات.

١٤)-تۆو نۆکە کێویلە جاری نیو پیاڵە بە کوتراوی بە ناشتا بخورێ هەمو کرمێکی گەدەو ریخۆڵە ئەکوژێ.

١٥)-گێزەرە دێمی جاری نیو پیاڵە بە کوتراوی بەناشتا بخورێ هەمو کرمێکی هەناو لادەبات.

١٦)-شنگ نیو پیاڵە بە کوتراوی بە ناشتا بخورێ کرمی گەورە و بچوکی ناو سک هەناو لادەبات.

١٧)-سیری زەرد کرمی ناوسکی مرۆڤ دەکوژێت .

١٨)-هاڕاوەی گوڵ هەنگوین یەک کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت بۆ جارێک کرمی ناوسک دەکوژێ.

١٩)-ئاوی سیر یەک پیاڵە + سرکە یەک پیاڵە + ڕەشکە یەک پیاڵە + دو پەرداخ ئاو بکوڵێ و بخورێ کرمی گەدەو ریخۆڵە دەکوژێ .

٢٠)ڕازیانە یەک پیاڵە + یەک کەوچک شەکر بکوترێ ئەمجا جاری یەک کەوچک لەو کوتراوەی + ئاوی‌گەرم ڕۆژی دوو جار بدرێ بە منداڵ بە ناشتا کرمی دەزولەیی دەکوژێ.

٢١)-گیای هوجودە بکوڵێ وەک چا بە ناشتا بەیانیان بیخوات کرمی ناوسک ئەکوژێ.

٢٢)-ئاوی سیر +سرکە + ڕەشکە ی کوترلو تێکەڵاو بکرێ ڕۆژی دوو جار کۆم وناوبەینی ڕانی منداڵەکەی پێ چەور بکە سێ ڕۆژ بۆ کرمی دەرزیلەیی اکسیوز دەکوژێ .

## نەخۆشیه کانی چاو

١)-بیبەری تون و گیاکەی +نەوشاتر یەکی ٥٠ غم بهارە و بیبیژەرەوە چاوی پێ بڕێژێ دوای ١سەعات بە ئاوی سارد بیشۆ ١٠ ڕۆژ تانەی سپی لادەبات.

٢)-کەتیرە بکوڵێ بەئاوە کەی دەمو چاوی پێ بشۆرێ یان پەل دارەکە بسوتێنێ دوکەڵەکەی بچێ بەدەم وچاو یا بۆ چاو خوراندن باشە.

٣)-گوڵی هێرۆ +شیری ژن (ئافرەت) گوڵەکە لەناو شیرەکەدا بخوسێ و دوای گوڵەکە بخرێتە سەر چاو ئێشەکە باشە.

٤)-گوڵی نیلو فەر ٥٠ غم +٢ پەرداخ ئاو بکوڵێت بخورێت ، ڕۆژی ٢جار بۆ چاو ئێشەوچاو سوربون .

٥)-گیا چاوانە ٢کەوچك +١پەرداخ ئاو بکوڵێت . ڕۆژی ٣جار بخورێت بۆ چاو سوربون و خوراندن زۆر باشە.

٦)-گوڵە پایزە بکوڵێت دەمو چاوی پێ بشۆرێ بۆ چاو ئێشە ، بیکوتێ و بیخەیتە سەر چا و بۆ ئەوانەی چاویان دەناوسێ .

٧)-شیلان بکوترێ و بکوڵێت و بەکەتانێکی تەنك بی پاڵێوە جاری سێ قەترە بکەیتە چاوتانەی سپی(بەلغی چاو لادەبات ئەگەر گزایەوە نەترسێ)ماوەی ٧ ڕۆژ بینایش بەهێز دەکات.

٨)-ماست بیشەڵقێنە یان توزێکی لێ بکرێتە چاو یان بە میلك چاوی پێ بڕژێرێ ٥ شەو لەسەر یەك چلك و پیسی بەڵغی چاو لادەبات.

٩)-گوڵی هەڵاڵە برمە بسوتێ دوکەڵەکەی بچێ بە چاوا خوراندن و میکرۆبی نامێنێ حەساسیەتی نامێنێ.

١٠)-شەمدانی گوڵ و گیاکەی ١٠٠ غم + یەك لیتر ئاو بکوڵێت سێ ژەم چاوی پێ بشۆرێ بینایی بەهێز دەکات.

١١)-خەربەن تۆوەکەی + کەرە بسوتێ دوکەڵەکەی بچێ بە دەم و چاویا خوراندن و حەساسیەتی چاوی نامێنێ.

١٢)-گوڵی یاسەمین ٥٠ غم + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێ و بخورێ بۆ چاو ئێشەو چاو سور بوون.

١٣)-گیلاس + ممنجیر + مەنگوین یەکی ١٠٠ غم بە ژەمیك سێ ژەم بخوریٚ بینایی چاو بەهێز دەکا ئاوساوی و بەڵغی نامێنێت.

١٤)-گوڵە حەریر بکوڵێت بە ئاوە کوڵاوەکە دەم و چاو بشۆریٚ چاو ئێشە چارە دەکات.

١٥)-گاڵەخواردنی گاڵ بینایی چاوان زیاد دەکات ،، گێزەر وسێو بۆ بینایی باشە.

١٦)-پیاز ٥٠ غم + رۆنی ئاژەڵ ٥٠ غم بە ژەمێك بخورێت بەیانیان و ئێواران ماوەی ١٥ رۆژ بینایی چاو بەهێز دەبێ.

١٧)-کنیواڵ ٥٠ غم + نەعنا ٥٠ غم + یەك لیتر ئاو بکوڵێت و ئاوەکەی بە دو جار بەیانی و ئێواریٚ بخوریٚ ماوەی ٥ رۆژ بۆ ئاوساوی پێڵوی چاو.

١٨)-جۆ یەك کەوچك + قەیتەران یەك کەوچك + دوو پەرداخ ئاو بکوڵێت ژەمی یەك پەرداخ بە دوو جار لە رۆژێکدا بخوریٚ بۆ چاو سووربون بۆ ٧ رۆژ.

١٩)-یەك کەوچك چا + یەك کەوچك شاتەرە + یەك پیاڵە شیر بکوڵێت و بخورێت بۆ چاو ئێشە.

٢٠)-تۆوی خاکە شیر (وەردێنە)+ شیر بخورێتەوە بۆ چاو ئێشە و بۆ خوراندنی چاو چارەسەری دەکات.

٢١)-چنور +دارچینی +زەنجەفیل + مقل ازرق یەکی ٥٠ غم جاری دوو کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێ و بخوریٚ بینایی چاو بەهێز دەکات.

٢٢)-ئاو چاو رەش دوو کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێ بیپاڵێوە ئەمجا چاوی پێ بشۆ بۆ إلتهاباتی چاووپێڵوی چاو زۆر باشە.

٢٣)-سێو ڤیتامین (A )تێدایە بۆ شەو کوێری زۆر باشە.

٢٤)-شیلان + گەڵا تەربی + خاکە شیر + گەڵای ژاڵە + تۆو خەربەن یەکێك لەمانە کەمێك بکە سەر ئاگر بسوتێ دوکەڵەکەی بچێ بە چاودا بۆ خوراندنی چاو.

٢٥)-زەردێنەی هێلکەی مریشکی کوردی تۆزێ گەرم بێ وەك شلەتێن ئەوەندە گەرم نەبێ چاوی ئازار بدا بکرێتە سەر لۆکە یان پارچەیەك شاف یان خام بکرێتە ناو چاوکەوەولێ بدریٚ زۆر بەسودە بۆ ئەوانەی کە ئاسن یان بەردێان خوێن کەوتوەتە چاویان ماوەی ٦ سەعات پێوەی بێت ٣-٤ جاردوبارە بکرێتەوە تەنانەت بۆتانەی چاویش بەکەڵکە.

٢٦)-ئەو پەردە تەنکەی کاتی منداڵ بون منداڵەکەی تیایە و دەدریٚ و شکی بکەرەوە بیهارە+سێ مسقاڵ نباتی مصری + ئاوی مقطر بکریٚ بە قەترە جاری سێ قەترە رۆژی سێ جار ئانەی سپی ئاوچاو لادەبات.

٢٧)-شیلان بەناو کەوە بهارە و + ئاو بکوڵێت دوای خەست بونەوە بە کەتانێ بیپاڵێوە رۆژی سێ جار جاری سێ قەترە بکە چاوی ئانەی تێدا بێ بۆ چەند رۆژێک ئانەکە لا دەبات.

٢٨)-چاوکزی کە لە کەم خوێنی‌یەوە بێت چۆلەکە گەرماو گەرم توکەکەی لێ بکرێتەوە ئەمجا + گێژەر بکوترێ + ئاو بکوڵێت ئەو کەسەی چاوی بێ هێزە بیخوات چاک دەبێت ماوەی ١٢ رۆژ بەکار بێت ژمارەی رۆژەکان بەقەدەر چۆلەکەکان یانی دوو رۆژ دوو دانەسێ‌هەم سێ دانە بەو جۆرە ١٢ رۆژ ١٢ چۆلەکە.

٢٩)-گوڵی گوندوان + مرز نجوش + بەیبون + گوڵی خەشخاش یەک پیاڵە + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێ سەر بگری بە هەڵمەکەیدا بۆ خوراندن چاکە ئەمجا یەک کەوچک + یەک پەرداخ بخورێ.

## نەخۆشیەکانی قورگ‌لەوزەتێن و دەنگیران و زمان گرتن

١)-گوڵە هێرۆ ٥٠ غم + قەیتەران ٥٠ غم + دوو لیتر ئاو بکوڵێ سێ ژەم ژەمی یەک پیاڵە پێش نان بخورێ ماوەی ٥ رۆژ بادەمەی قورگ لەوزتێن چاک دەبێ.

٢)-جەرگو حیجازی + کەمای زەرد دوای کوڵان غەرغەرەی پێ بکرێ بۆ لوزتێن و دەنگیران باشە.

٣)-رەگی کەتیرە ٣٠ غم + رەگی بەڵەک ٣٠ غم + دوو پەرداخەئاو بکوڵێت جاری یەک پیاڵە لە ئاوەکەی بخورێ بۆ دەنگیران و زەلاڵی دەنگ باشە.

٤)-بادەمی‌تاڵ + شیلان بێ ناوکەکەی + هەنگوین لە هەریەک ٢٠٠ غم بدرێ بە منداڵ کەرو لاڵ بە منداڵی گوێ گران چارەسەر دەکات.

٥)-گوڵە هێرۆ + قەیتەران + وەنەوشە یەکی ١٠٠ غم + یەک لیتر ئاو بکوڵێت دوو ژەم ژەمی یەک پیاڵە بخورێت پێش نان ماوەی ٧ رۆژ بۆ دەنگ گیران.

٦)-کەمای زەرد دۆشاوی کەما بە شێوەی تایبەت دەگیرێ بە کوڵاندن ئەمجا ژەمی بەقەدەر یەک نۆک بکاتە ئاو بیخوات دەنگ بەر ئەدا.

٧)-دەرمانە ئازار (گوڵە دەوری)جاری یەک کەوچک لە گوڵەکەی + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت و بدرێ بە منداڵ زمان ئەگرێ.

٨)-ئاوە سپییەکەی کە لە بەینی برگەکانی مێش دا هەیە + زەنجەفیل + گوڵە باخ+نارنج یەکی ١٠٠ غم ئەمجا یەک کەوچک + یەک پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێ بۆ زمان گرتن.

٩)-هەزبی ٥٠ غم + چا کێوی ٥٠ غم + یەك لیتر ئاو بکوڵێت ڕۆژی دو جار غەرغەرەی پێ بکرێ و بخورێتەوە لەوزەتێن چاك دەكات .

١٠)-یەك كەوچك چا كەتیرە + یەك كەوچك هەنگوین یانی كەوچكی چێشت تێكەڵاو بكرێ و بخورێ بۆ دەنگیران بەری دەدات دەنگ زەلاڵ دەبێ.

١١)-گژنیژ بە كوڵاوی ئاوەكەی بیگرێ بكرێتە ناو دەمی ئەو منداڵەی توشی (فطریات) زیبكەی سپی ئاو دەم بون چاك دەبن بۆ چەند جارێك.

١٢)-هەزبی + گوڵی پونگە + گەزنە یەكی ٥٠ غم ئەمجا لە هەموی جاری دوو كەوچك+یەك پەرداخ ئاو بكوڵێت ئەمجا + ڕۆن زەیتون ڕۆژی سێ جار غەرغەرەی پێ بكرێ بۆ لەوزەتێن .

١٤)-هەزبی + نەعنا بیكوتە و جاری یەك كەوچك بكوڵێت وەك چا بخورێت ڕۆژی سێ جار بۆ إلتهاباتی لەوزتێن چارەی دەكا.

## نەخۆشیەكانی لوت

١)-شیلان یان گەڵا تەڕبی یان خاكشێر هەر كامێكیان لەسەر ئاگر بسوتێنی دوكەڵەكەی بچێ بە لوتدا بۆلوت گیران و لوت خوراندن باشە.

٢)-٢٠ دەنك بادەمی تاڵ بهارە و + ڕۆن زەیتون بیكەشوشەیەك ماوەی ٢٤ سەعات بۆ إلتهابات و(جیوبی أنفی)جاری چەند قەترەیەكی تێ بكە .

٣)-پونگە + هەزبی + گەزنە + سوسی ئارد بكرێ بە دەستە نەرمە بخرێتە سەر نەوچاوان شەوان(بۆ إلتهاباتی جیوبی انفی) باشە.

٤)-بۆ زیبكەی سەر لوت بەردی گەرم بنێ بە زیبكەكەدا دو جار ماوەی سێ ڕۆژ هەمو جارێ بە ئاوی گەڵای ژاڵە بیسڕە چاك دەبێ

٥)-بۆ نەزیفی لوت ماڵی جاڵجاڵۆكە (تەنالی شەیتانۆكە)ورد بكە بیكە لوتی خوێنی دەوەستێ.

٦)-خوری مەڕ نەشۆراوە بسوتێ دوكەڵەكەی بچێ بە لوتیا ئەوا خوێنی دەوەستێ یان كاربۆنە سوتاوەكەی بكە لوتی خوێنی دەوەستێ بۆ هەمیشە.

٧)-بۆ لوت خوران عناب بە دەرزی كون كون بكرێ و بخرێتە ناو ئاگرەوە دوكەڵەكەی بچێ بە لوتیا ئالۆشی و تەنگەنەفەسی نامێنێ.

٨)-دوو کەوچك ڕەشکە + یەك پیاز ورد بکرێت و بکرێنە قاپێکەوە بسوتێ و دوکەڵەکەی بچێ بە لوتیا بۆ هەڵامەت⁹تکەی لوت چاك دەکات.

٩)-ئاوی شەمامە بگیرێ + ڕۆنی وەنەوشە تێکەڵاو بکرێ وەك قەترە ڕۆژی سێ جار جاری سێ قەترە ئەوانەی بۆن ناکەن چارەیان دەکا .

## قاچ قڵیشان و فطریاتی بەینی قاچ

١)-گیا مەڵهەم +گەڵا بەڕو + گەڵا ڕکێشە + گەڵا پەموو یەکی ١٠٠ غم بۆ لیتر ئاو بکوڵێت دۆشاوەکەی بۆ پاژنە قڵیشان و بەینی پەنجە.

٢)-تەماتە مارانە بکوڵێت دۆشاوەکەی بۆ فطریاتی بەینی پەنجەی قاچ پێی چەور بکرێ.

٣)-گیا زەنگوڵ بکوڵێت دۆشاوەکەی ئاوی تەماتە و ئاوی ڕەزڵە مارانەی تێ بکرێ بۆ پاژنە قڵیشان پێی چەور بکرێ.

٤)-گەڵای چەوەندەر ئاوەکەی بگیرێ بۆ دەست و قاچی قڵیشا و زۆر باشە پێی چەور بکرێ.

٥)-گوڵە پایزە بە گەڵاو گوڵ و ڕەگەوە بیکوتی و بینێی لە پاژنە قڵیشاو چاکی دەکات.

٦)-گوڵە کەرکەب ١٠٠ غم + ڕۆن بادەم ١٠٠ غم بیکوتە و بۆماوەی یەك مانگ هەڵی بگرە لە دوای مانگەکە بۆ دەست و قاچی قڵیشاو و زۆرباشە پێی چەور بکرێ.

٧)-گەڵا کەرچەك دو کەوچك + یەك پەرداخ بکوڵێت و بخورێتەوە بۆ دەست و قاچی قڵیشاو چاك دەبێتەوە.

٨)-خەربەنگ + ئاوکی گوژاڵك بکوترێ + خەنە + ئاوی سیر بکرێ بە مەڵهەم بۆ قڵیشاوی قاچ زۆر باشە بۆ دەست و برینی گوڵ و سەرداوی نەبێ.

٩)-خەربەنگ بکوترێ + ماست بکرێ بە مەڵهەم و بدرێ لە قڵیشاوی قاچ چاکی دەکا.

١٠)-سوتانی تۆوی خەربەنگ یانی دوکەڵەکە بچێ بەسەر قڵیشاوی و قاچ و دەستڕلیو چاکی دەکات.

## مێخەك و بالوكە

١)-لە تێك تەماتە بخەرە سەر مێخەکەکە شەو هەتا بەیانی پێوەی بێ بە دوو شەو دەری ئەهێنێ.

٢)-بۆقێك بە زیندوویی ناو سکی دەربهێنەو بیخەرە سەر مێخەکەکە شەو تا بەیانی دەری ئەهێنێ.

٣)-پیازی پیشاو بیکوتە + سابونی ڕەقی بینێ لە مێخەکە چەند جارێك ڕای دەکێشێ و چاك دەبێ.

٤)-بۆ ئێسکی زیادەی ژێر پێ کە ئەویش جۆرێکە لە مێخەکە پیازی نێرگس+مازو بیان کوتە + خەنە چەند جارێك شەو بینێ لە پاژنەو ژێر پێ چارەی دەکات بە ٤ شەو.

٥)-گیای قەیتەران + شینە شاتەرە تێکەڵاوی کە یەك پیاڵە +یەك پەرداخ ئاو بکوڵێ وە بخورێ ڕۆژی دوو جار ماوەی ٥ ڕۆژ بالوکەکە ماوەیەك دوای ئەوە هەڵ دەوەرێت.

٦)-پیفو (پوشو) بیسوتێنە و بیخەر سە ربالوکەکە چەند جارێك دوبارەی بکەرەوە دوایی هەڵ دەوەرێ.

## نەخۆشییەکانی گوێچکە هەو کردن و ئازاری وگوێ گرانی

١)-جەوی تویسی ٥٠ غم + ڕۆن بادەم ٥٠ غم بکرێت بە قەترە بەیانیان دوو قەترە تێ بکرێ بۆ کەڕی و هەوکردنی گوێچکە.

٢)-ڕۆنی بادەم تاڵ + ڕۆن زەیتون تێکەڵ بکرێ ١٢ سەعات دابنرێ دوای ئەوەی بەیانیان دوو قەترە تێ بکرێ بۆ ئازارو هەو کردن.

٣)-بادامی تاڵ +هەنگوین + شیلان بێ ناوك یەکی ٢٠٠ غم بۆ ڕۆژێك بدەرێ بەوانەی کە گوێیان گرانە بە تایبەتی منداڵ چاك دەبێ بیخوات.

٤)-ڕۆنی بادەمی تاڵ +ئەسپینی هاڕلو بکرێ بە فتیلە و بخرێتە ناو گوێی جەراعەتاوی و إلتهاباوی چاکی دەکا و هەو کردنی نامێنێ.

٥)-گوڵە عەرعەر + کەلا توو بکوڵێت و دۆشاوەکەی بنا گوێی منداڵی پێ چەور بکرێ بۆ ئازاری گوێ ئێشە چاك دەبێ.

٦)-گوڵە کێوی (گوڵە ئاریان) گوڵ و گیای بکوڵێنت بپاڵێوری ڕۆژی دو جار جاری سێ قەترە بکرێتە گوێ(إلتهابات)و جراعەت چارەسەر دەکا .

٧)-زراوی گا جاری یەك قەترە بکرێتە گوێی گران بۆ ماوەی سێ ڕۆژ چاك ئەبێ .

٨)-دروست کردنی قەترەی ئاوی تور بۆ ئەوانەی کە بەهۆی گرانەتاوە گوێ یان گران بوە یان کەڕبوە.

٩)-تورێکی گەورە بهێنە ناوەکەی هەڵ بکۆڵە دوو کەوچك ڕۆن کونجی + دوو کەوچك روبە هەنار+یەك کەوچك سرکە .بیکە ناو تورەکە سەر قاپەکەی بنێرەوە ئەمجا بە قوڕ سیواقی بدە و بیخە ناو ژێڵەوە هەتا ئەپێشێ دوای پیشانەکە دەبێ بە قەترە ڕۆژی سێ جار جاری دوو قەترەی تێ بکە ٣-٤ ڕۆژ.

١٠)-٢٠ غم ڕۆن زەیتون + ٢٠ غم نەوتی سپی یانی لەهەر یەك ٢٠ سی‌سی تێکەڵاو بکرێ گوێ ئێشە چاك دەکات.

١١)-ڕۆن کونجی ڕۆژی سێ جار جاری ٤ قەترە بکرێتە گوێچەکە دۆمەڵی لێ هاتبێ و گران بوبێ چاکی دەکات.

١٢)-ئاوی پیازی سەلکی نێرکس بگیرێت وەك قەترە ڕۆژی سێ‌جار جاری ٤ قەترە تێ بکرێ بۆ گوێچکە ی زیبکە لێ هاتبێ و گران بو بێ.

١٣)-گەڵا زەیتونی هاڕاو + شیلە هەنگوین بکرێ بە شاف و بخرێتە ناو گوێچکەی جەراعەتاوی چەند جارێك چاکی دەکات وە تا ماوەی ٥ ڕۆژ قەترەی ڕۆن زەیتون و بادامە تاڵەی بکاتە گوێی جاری سێ قەترەی کە ڕوگرانی نامێنێ.

١٤)-تۆو کامو ٥٠ غم + ترشە سماق ٥٠ غم + یەك لیتر ئاو بکوڵێ بە سێ جار بخورێتەوە بۆ ئەوانەی گوێچکەیان ورەوڕ دەکات بە هۆی زۆر بونی چەوری و کولیسترۆڵ بەمە چاك دەبێتەوە.

١٥)-کونجی سور+ کونجی سپی ئەندازەیەك بسوتێ دوکەڵەکەی بچێ بە گوێی ئێشاودا چاك دەبێ.

١٦)-دوکەڵی جگەرە بکرێ بە گوێی ئەوانەی کە گیاندار دەچێتە ناو گوێ یان قانگ بدرێ بە جگەرە ئەوا دێنە دەرەوە بە مردوی ڕزگار دەبێ.

## قەڵەوی وخوێن زۆر بوون

١)-سێو ڤیتامین A تێدایە و ئاسنی زۆرە خوێن زۆر دەکات و قەڵەوی دەکات.

٢)-ترێ خواردنی ئاوی ترێ خوێن زۆر دەکات و مرۆڤ بە هێز و قەڵەو دەکات.

٣)-دۆشاوی سپێناغ + ئاوی هەنار بۆ خوێن زۆر بوون بۆ ئەوانەی رەنگیان زەردە بەهۆی نەخۆشی‌یەوە زۆر باشە رەنگیان جوان ئەکات.

٤)-ئاوکی هەرمێ کێویلە بکوترێ جاری یەک پیاڵە رۆژی سێ جار ماوەی ٧ رۆژ بۆکەم خوێنی زۆر باشە چەوری لە خوێنیش لا دەبات.

٥)-قنگر وشك بکرێتەوە جاری ٥٠ غم بە کوتراوی+ئاوبکوڵێت و بخورێت بۆ قەڵەو زۆر باشە بۆ غودەش بەکەڵکە.

٦)-یەک پەرداخ ئاوی سێو + یەک پەرداخ ئاوی ترێ + یەک کەوچك هەنگوین رۆژی سێ جار بخورێ ماوەی ٧-١٠ رۆژ.

٧)-هەنگوین یەک کغم + رەشکە ٢٥٠ غم + رازیانە ٢٥٠ غم بهاڕێت و تێکەڵاو هەنگوینەکە بکرێ رۆژی سێ جار جاری دوو کەوچك بخورێ.

٨)-خواردنی قنگر بە کوڵاوی بە کاڵی خواردنی ئاوکەکەی مرۆڤ بە هێز و قەڵەو دەکات.

## بۆ دان ئێشە

١)-توێکڵی فەریکە گوێز + کەرەوز + مێخەك + سیر بیان هارە + یەک لیترئاو بکوڵێت ئەمجا لە دەمی رابدات بۆ دان ئێشە.

٢)-مێخەك + توێکڵی هەنار + توێکڵی فەریکە گوێز + تۆزێ خوێ بیان هارە + ئاو بکوڵێت جاری یەک کەوچك لە دەم رابدە (غەرغەرە) .

٣)-مێخەك یەک کەوچك + چا یەک پیاڵە بخورێت ژانی دان ئەشکێنێ یان بیکاتە سەر دانی.

## قاچ و دەست سڕ بوون

١)گەزنە + مازو + گزگڵ + خەنە بیان هاڕە/شەو بینێ ژێر پێ یان لە دەستە سڕبووەکە بۆ چەند جارێك چارەی دەستو قاچ سڕبوون دەکات و بۆ نارەق کردنەوەی دەست و قاچیش چاکە بۆ برینی شەکرەش چاکە.

٢)-گوڵی پێشوو یەك کەوچك چا + یەك پەرداخ شیر بخورێت دەست سڕبوون چارە دەکات قاچ سڕبوون چاك دەکات.

٣)-کونجی + توو + گوێز جاری ٥٠ غم بخورێ ڕۆژی سێ جار ماوەی ٢١ ڕۆژ بۆ دەست و قاچ پێڵوی چاو کە بلەرزێ چارەی دەکات .

## نەخۆشیەکانی غودە

١)-خواردنی ٨٠٪ مادەی یۆد بۆ ماوەی ٤ ڕۆژ بۆ نموانەی غودەی سامیان هەیە غودەی سامی دەرەقی یا لعفاوی/ئەو مادەی کە یۆدی تیا بێ لە گژو گیا دا هەیە کە مادەی (تیمول)(تانن)(پیتول) میکروب کوژن

٢)-٣٠ غم ڕازیانە +٢٠٠ غم تەرەتیزە تێکەڵاوی بکە ئەمجا سێ کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت پێش نان ڕۆژی سێ جار ماوەی یەك مانگ.

٣)-گەڵا گوێز ٢٠٠ غم + گەڵا بناوش ٢٠٠غم + قمیتەران ١٥٠ غم بە ئەندازەی تێکەڵاو بکە ئەمجا دو کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت ڕۆژی دوو جار ماوەی یەك مانگ.

٤)-کوزەڵە + ماکوز یەکی ٢٥٠ غم بە کوترلوی جاری دوو کەوچك + یەك پەرداخ ئاو بکوڵێت و بخورێت ڕۆژی دوو جار ماوەی یەك مانگ.

٥)-ئاوی گێزەر وە ئاوی ترێ وە ئاوی لیمۆی شیرین وە ئاوی سیر مادەی یود و گوگردیان هەیە بۆ غودە زۆرباشن.

٦)-قنگری وشك ٥٠ غم + دوو پەرداخ ئاو بکوڵێت دوو جار بخورێ بۆ غودە باشە یۆدی تێدایە.

## سوتاوی

١)-رەگی قنگر بهارە و بیبیژەرەوە + ڕەشکەی برژاو بهارە + ماست بکرێ بە مەلهەم بۆ هەمو سوتاویەك.

٢)-رۆنی زەردێنەی هێلکە بە پەڕە مریشك سوتاویەکەی پێ چەور بکە چاك دەبێت بەیانیان و ئێواران.

٣)-٢٠ هێلکە بە بێ رۆن بیکە ناو قاپێك لەسەر ئاگرێك لەسەر خۆ گەرمی بکە تا ئەسوتێ وەك خەڵوز رۆنی هێلکە بەدەست دێ بیکە شوشەوە و بیدە لە سوتاویەکە.

## وەرەمی مەمك

١)-بەمێ + مەنگوین بکوڵێت ئەمجا وەك نیوتەك بنرێ لە مەمکێك کە گرێی هەبێ یان زەلکوتیا ڕەق بو بێت.

٢)-ئاردی جۆ + پونگە بیان هاڕە و بیکە بە نیو تەك (دەسە نەرمە) بیخە سەر مەمکی گرێ کردو چاکی دەکات.

٣)-نیسکی زەرد کراو (نیوە کوڵ)+ کەلەرم بنرێ لە مەمکی گرێ کردو چارەی دەکات .

٤)-تونکڵی بی + خەنە + سرکە تێکەڵاوی بکە و بدرێ لە مەمکێك إلتهاباتی هەبێ چارەی دەکات بۆ چەند جارێك.

٥)-زەردێنەی پشتی قرژاڵ ی زیندو بیشکێنە و بیکە سەر برینی إلتهاباتی مەمك بۆ چەند جارێك چاك دەبێ.

تێبینی :-بۆ ئەو کەسانەی گولە یان پارچەی ئەڵغام و قومبلە لەناو لەش و گیانیاندا جێگیر دەبێ بۆڵێك بە زیندوویی هەڵدرن شەو بینێن لە شوێنی برینەکە بە چەند شەوێ ٢-٣ شەو دەری دەهێنێتە دەرەوە لەناو گیانیدا بەبێ عەمەلیات.

## ناوی گیاکان و سیفاتەکانیان

**خوژی - گیا دوخـەوا (سـریش):-** ئەم گیایە لە کوردستاندا دەڕوێت لە بارەی دەرمانەوە کەلکی لێ وەردەگیرێ لەگەڵ خواردن بەکار دێت لە شاخەکاندا بە دەم بەفرەوە دەڕوێت گەڵای شین و پانە پیازی هەیە.

**قەیتەران - سەقرا بەر (شعر الخـنزير):-** ئەم گیایە لە بارەی دەرمانەوە و سودی زۆرە لە کوێستان دەڕوێت زۆر بەکەڵکە بە ئەندازەی ٣٠-٤٠سم بەرز دەبێتەوە و لاسکی باریکو ڕەشە گەڵاکانیان و سەوزە بە دەم شاخەوە دەڕوێت لە شوێنی نم ناکدا کە ئاو دار بێتـئەم گیایە زۆر سودی هەیە بۆ زۆرێك لە نەخۆشیەکان.

**گوڵە ئەستێرە -گوڵە ئاسۆ(اسطير) :-** ئەم گوڵە لە پێدەشتەکاندا دەڕوێت سودی دەرمانی لێ وەردەگیرێ لە ناوەڕاستی مانگی بەهاردا گوڵ دەکات لە شاخی مەراجی گوندی سەردوش سەر بە شاری مەریواندا زۆرە ئەم گیایە ٥ پەڕەو تا ٢٥ سم لەزەوی بەرز دەبێتەوە گوڵی ڕەنگاو ڕەنگ و جوانە بۆیە پێ دەڵێن گوڵە ئەستێرە.

**گوڵـە جـام - دۆشـان (أذان الفـار نبطي):-** ئەم گیایە لاسکی باریکە لە بارەی دەرمانـەوە سودی لێ وەردەگیرێ بۆ برین،گوڵە جام لە ناوچەی دەشتەکاندا دەڕوێت تا ٤٠-٥٠ سم لە زەوی بەرزدەبێتەوە.

**سیر - سیرە کێویلـە (ثـوم - کـراث الـدب):-** سیر لە بارەی دەرمانەوە سودی زۆرە لە رادە نایەت بۆ هەمو مرۆڤێك پێویستە و بەسودە لەسەر شێوەی کەوەر و پیازدایە لە ئاخیری مانگی بەهاردا دەکرێت.

**کنیواڵ - کوڕادە (کراث نبطي):-** کێنوال لە کوردستان زۆرە چەند جۆری هەیە ئەم کنیواڵە گیایەکی کێویەتامی توندە گەڵاکەی لە شێوەی گەڵای کەوەر دەچێت،بە ئەندازەی ٢٥ سم گەڵاکەی بەرز دەبێتەوە وە لە ئاخیر مانگی بەهاردا وشك دەبێت تۆوەکەی لە شێوەی تۆوی پیازە لە بارەی دەرمانەوە سودی زۆری لێ وەردەگرێ .

**کەوەر - کەرەسا (کراث رومي):-** لەگەڵ خواردنی رۆژانە مرۆڤ سودی لێ وەردەگرێت .

پیچکە ، پیوچکە (کراث الـدب البري):- گەڵای سەوز و سێ سوچە گوڵی زەردە لە شاخەکانی کوێستاندا زۆرە سودی دەرمانی لێ وەردەگیرێت لە شاخی میاجی و گوڵیەن دا زۆرە خەڵکی گوندی سەرنۆش بەکاری دێنن.

پیاز- پیواز (بصل):- چەند جۆری هەیە جۆری سپی سوێر لە هەمویان سودی زۆرترە بۆ مرۆڤ (K.C.E.D)تیایە.

سەبر - سەبری زەرد (الصبر):- ئەم گیایە لە گەرمە سێر دەروێت لە بارەی دەرمانەوە سودی زۆرە بەرگری جەلدی مێشك دەكات رەگەکەی دەرمانەڕەنگی ئەستورە و گەڵای پانە وەکو دارە لەدێمدا دەروێت.

گیا دڵ ژان - خاوێن (بە هەورامی) (ذیل الفار):- ئەم گیایە لەبارەی دەرمانیەوە سودی زۆرە بۆ داخلی و خارجی جسم سودی لێ وەردەگیرێ ئەم گیایە شاخەکاندا دەروێت تا ٦٠ سم بەرز دەبێتەوە چوار فەسڵە سەوزەتەمەنی زۆرە ئاخر مانگی بەهار گوڵ دەکات بۆنی خۆشە لاسکی چوارگۆشەیە لەسەر شاخەکاندا دەروێت لە گوندی خاوێن سەر بە قەراخ دا دەست دەکەوێت.

گوڵە مزانی - گوڵاڵە سورە (لالة حمراء):-ئەم گوڵە بەهاران دەروێت سور و مۆر و سپی هەیە گوڵاڵە سورەی بەهاری پێ دەڵێن، تا ٣٠ سم بەرز دەبێتەوە وە گیای وردە تۆوەکەی ڕەشە.

گیا مەڵحەم - زنگو لەبچك (هەورامی) (فیصوم أنثى):- ئەم گیایە بۆ مەڵحەم و برین سودی زۆرە لەسەر شێوەی دەوەن دەروێت گوڵی مۆر و سور دەگرێت داری مەڵهەمی پێ دەڵێن لە ناوچەی پێنجوێن دا زۆرە.

قومام - پەڵە سورە - سفڤن :- سودی لێ وەردەگیرێ وە لەسەر شێوەی جۆیە تا ٧٠ سم متر بەرز دەبێتەوە گیای باریك و درێژە.

زەنگوڵە گیلبەرزەلنگ ، شیخ خراسانی :- ئەم گیایە بۆنی خۆشە و لە هەمو شوێنێکی کوردستاندا زۆرە بۆنی وەکو بۆنی هەزبێ توندە لەناوچە شاخاویەکاندا دەروێت بە بەرزیەوەیە بۆیە پێی دەڵێن بەرزە لنگ.

گوڵەتاڵە (ورد الیبغ) :- ئەم گیایە بۆ برینی (جراحە تاوی)وەکو مەڵحەم سودی لێ وەردەگیرێ .

تەماتە مارانە - رزلە ( ست الحسن ):- ئەم گیایە لەسەر شێوەی تەماتەیە تا ٥٠ سم بەرز دەبێتەوە بە بنچ دەڕوێت بەڵام تەماتەی ئەم گیایە زۆر وردە پێی دەڵێت تەماتە مارانە گیایەکی سەدارە(ژاراویە) بۆنی وەک بۆنی تەماتە وایە.

کارگە شێرێ - هەڵچوویە شوتی - قارچک دار ( أغاریوقون احمر ):- ئەم کارگە ژاراویە مرۆڤ هیلاک دەکات لەگەڵ ئەخوارنی.

بەردەگیا و ورگە مەر ( اخلیا البري - . . ):- ئەم گیایە لە منتیقەی پێنجوین زۆرە تا ٧٠ سم بەرز دەبێتەوە لاسلکی پەلە گوڵی زەرد دەگرێ بۆیە پێی دەڵێن بەردە گیا بە نارەحەت دەبڕێت.

جۆی ورچ ( خـــافور ):- لە کوردستاندا زۆرە لەسەر شێوەی جۆیە لە دێم دا دەڕوێت بەقەراخی جۆگەدا.

جۆی شامی-جۆی دوسەر ( هرطمان ):- تا ٦٠ سم بەرز دەبێتەوە بۆ دەرمانی سودی لێ وەردەگیرێ .

تۆڵەکە مارانە -مارکولە ( أفسیطن کبیر ):- لە بارەی دەرمانەوە سودی لێ وەردەگیرێ و لە کوردستاندا زۆرە.

درکە ئاڵەت - زروێ ( اشنا البري ):- ئەم گیایە رەگەکەی سودی لێ وەردەگیرێ،رەگی سورە ئەم گیایە دێمی‌یە لەلای خەڵکی بە تەسپونی ناسراوە بە هاویناندا رەگەکەی کۆدەکەنەوە بۆ کاری دەرمانی.

شێرەدار دارکێک ( أسفندان البري ):-لە کوێستاندا هەیە تا ٤-٥ متر بەرزدەبێتەوە گەڵای پانە ، درەختە. .

شابەنگ بـۆ ژنـە رەشـە ( اخلیا أسود ):-گوڵی زەردو بە کۆمەڵە پـرە تـا ٥٠ سم بەرز دەبێتەوە گەڵاکەی بڕگە بڕگەیە گوڵو گیای کەڵکی لێ وەردەگیرێ ..

زەردە شابەنگبۆژانە ( اخلیـا ) :-بۆ نەخۆشی داخلیش کەڵکی لێ وەردەگیرێت لەگەڵ شابەنگ یەک رەنگن،مرۆڤ گێژ دەکات بەخواردنی .

گوڵە نوروزانە ، گوڵە وەهارە ( ناب الجمل ):- ئەم گوڵە سودی زۆرە تا ٣٠ سم بەرز دەبێتەوە و رەنگی سورو سپی هەیە.

جۆتالە ، پەوە تاڵی ( جوهرز ):- بۆ ئاژەڵ بەسودە .

گیانگیر - کرم کوژ ، هەڵاڵەهەڵ (شوکران صغیر) :-ئەم گیایە ژاراویە بۆ برین و سودی لێ وەردەگیرێ گوڵی سپی و پاش گوڵ دەبێ بە درکێکیان گیرە)، ئەم گیایە تا ١م بەرز دەبێتەوە دێم و ئاوی هەیە.

گوڵە گیا ، گورگ کوژ .(قاتل النمرة) :- ئەم گوڵە چوار جۆرەگوڵی شین و بنەوشە بە توێڵ لە بارەی دەرمانەوە سودی لێوەر دەگیرێ لە پێ دەشتەکاندا دەڕوێت.

بەیبونە رۆمی - شێرازی (بابونج) :- ئەم جۆرە سودی زۆرترە لە شاخ دەڕوێت لە گوندی سەردۆش و ناوچەی مەریوان زۆرە گوڵ و بەرگی گوڵەکەی زەردە تا ٤٠ سم بەرز دەبێتەوە لە دەرمیاندا دەست دەکەوێت لەسەر بنچ دەڕوێت و گیایەکی وەکو گیای شوێت وایە گیای وردە بۆنی خۆشە بۆنی بهیە دەدات.

دەرمانە گمیز -سول (حشیشە الملاك) :- ئەم گیایە سودی زۆرە لە شاخی دەرمیانو شاخی میاجی گوندی سەردەشت و مەریوان زۆرەودەست دەکەوێت .

هاز - گوڵە خاز (ترياق الأبيض) :- ئەم گیایە گوڵی سورەوزمان دەبڕێ وتوندە . لەبارەی دەرمانیەوە سودی هەیە تا ٥٠ سم بەرزە گەڵای پانە لە کوێستاندا دەڕوێت وەکو پیاز سەلکی هەیە.

دەرمانە ئازار - گوڵە دوری (عاقر قرحا) :-پەڕەی گوڵەکەی و ناو گوڵەکەی زۆرە لە پێنجوێن هەیە سودی لێ وەردەگیرێ و گیای لاسکی وەکو شوێت وایە گیایەکی وردو دەرزیلەیی هەیە.

کاشمە - (کرفس البری) :- ئەم گیایە سودی زۆرە وەکو گەڵای مێو وایە لە شاخەکانی کوێستانی مەریوانوسەر شیوی مەریوان زۆرەگەڵای پانەو تا ٢٥ م بەرز دەبێتەوە.

یەزدان پەرست (رأس الملوك) :- ئەم گیایە ڕەنگی ئەستورەوژاراویە بۆ برین بەکار دێت ٧٢سم بەرزە.

سەول (قطيفة) :- ئەم گیایە لە کوێستاندا هەیە بۆنی خۆشە و تا ٧٥ سم بەرزە پێی دەڵێن سەوڵی خەرامان.

حیل حب الهال :- لەگەڵ بەنوشە وەکو یەك وان لە بارەی دەرمانەوە لە ناوچەی گەرمەسێردا دەڕوێت.

بادەمی شیرین (لوز) :- باشترین جۆری هی کوێستانە بەمێز ترەوترەختە ٤-٥ م بەرز دەبێتەوە(چوالە بادەمی پێی دەڵێن .

بادامەتاڵە (لوز مر):- لە کوردستاندا زۆرە لە کوێستاندا هەیە ئەمیش هەر لەسەر شێوەی بادەمی شیرین وایە.

گوڵە زاوا (أذان الفار اللبطي):- ئەم گیایە لاسکی باریکەو زاڵوریە بۆ مەڵحەم بەکار دێت.

داربەڕو. (بلوط الملك):-دار بەڕوی سودی زۆرە تا ٦ مەتر بەرز دەبێتەوە لە کوێستانی کوردستاندا زۆرە لەلای خەڵکی کوردستان ناسراوە.

دار دروشە (کتلبە) :-ئەم درختە لە هەمو شارێك هەیە بۆ زینەتی شەقامەکان دەروێنرێت لاسکەکەی درکاویە.

تاوگ - تایلە (المیس) :- ئەم درختە لەسەر شێوەی داربیە لە قەراخی سیروان زۆرە لە کەلارو و دەربەندیخان هەیە بۆ لەرزو گرانەتا سودی لێ وەرئەگیرێ پێی دەڵێن دەرمانە لەرزە.

گوڵەگەنم (علیر ، قنطوریون):- ڕەنگی گوڵەکەی شین و سورە گوڵی تۆپڵە لە پێن دەشتەکاندا دەروێت.

دار ئەرخەوان (أرجوان):- ٣ مەتر بەرزە گوڵی مۆرو جوانە لەهەمو شوێنێکی کوردستاندا هەیە.

کەرگوڵ (الشوکە البریە):-لە هەمو شوێنێکی کوردستاندا زۆرە گەڵای پانە و درکاویە گوڵی بە تۆپەڵە مۆرە.

توتن کێوی - گوشەنەوە (خاز بشرکي):- گوڵی زەردە گەڵای پانە تا ٦٠ سم بەرزە گەڵای شینە لاسکی باریکە لە دێمدا دەروێت بۆ دەوانکردنی برین سودی زۆری لێ وەرئەگیرێ .

جۆی باخی -(السس) لەسەر شێوەی گەنمە ٧٠ سم بەرزە لە دێم دەروێت گیای گەڵاکەی باریکە.

بەرزە لنگ (شیح):- گەڵای گیاکەی وردە و باریکە لە شاخە بەرزەکاندا دەروێت لە بارەی دەرمانەوە سودی زۆرە .

بۆزانە کێویلە (حبق الراعی) :-لە پێدەشتەکاندا دەروێت گوڵی زەردە گەڵای وردە بەئەندازەی ٥٠ سم بەرز دەبێتەوە.

تونە گیا - ئەرغون (العوزان):- ئەم گیایە ماڵی کراوە لای سەوزە فرۆشەکان زۆرە گەڵاکەی وردو باریکە بۆنی خۆشە .

بناوە تۆم - پوورپیچ (آذان الفیل):- ئەم گیایە لە پێنجوێن هەیە لەناو چەمو ڕووبارەکاندا تا ١،٥ م بەرز دەبێتەوە کورت و دار و گەڵای لە گوێچکە فیل دەچێ لاسکی سورە گەڵاکەی بە ئەندازەی گوێ فیل گەورە ترە پێی دەڵێن بناوە تۆم گیایەکی ئاویە بێ ئاو ناژی بۆ دەرمان سودی زۆرە.

شروو - شرووی (شجرة العرب):-ئەم گیایە لە شاخەکانی کوردستاندا زۆرە بۆ برینی جەراحەتاوی مەلحەمی لێ دروست دەکرێت ئەم گیایە لە ناوچەی هەورامانیدا زۆرە.

گوڵە هەنگ - گوێرە گیا (آذان الأبیض):- السنطیني پێ دەڵێن لە شاخ و دەشتی کوردستاندا زۆرە ، گوڵی زەردە نیوەمەتر بەرزە تا می تا لە بۆ دەرمانی سودی زۆرە بە گوڵە هەنگ ناسراوە.

قارچك گوڵانە ، کارگە گیاوی (فاریقون):- ئەم قەرچکە ژاراویە ناخورێت لە بارەی دەرمانیەوە بۆ ئازاری جسم کەڵکی لێ وەردەگیرێ.

قارچکی جنانی (فاریقون القاتل):- ژاراویە لەناو بی دا دەڕوێت بۆ مەلحەم سودی لێ وەردەگیرێ لە دێم دا دەڕوێت لە هاوین دا ترکەکەی شین دەبێت.

کۆڵەوار (عاقول):- ترکێکی شینە پێی دەڵێن ترکە کەوە دەست دەکەوێت نیمچە درختە.

چواڵە لوسکە - ئارژنگ (لوز الجبل):- لە شاخەکانی پێنجوێن زۆرە لە ملەکەوە .

جالۆری کێوی - کەرەوز کێویلە (بقدونس البری):-لەسەر شێوەی کەرەوز تا یەک مەتر بەرزدەبێتەوە لەسەر چنار لای مەعمەل چیمەنتۆ کە زۆرە لە گوێی چەمدا ئەم گیایە گەڵاکەی لە شێوەی جەعفەریە گیایەکی ئاویە لە گوێی چەم و ڕووبارەکاندا دەڕوێت .

گوڵە هێرۆ - هەرمەلە (خطمي):-لە هەموو جێگایەکی کوردستاندا دەست دەکەوێ لەبارەی دەرمانیەوە سودی زۆرە تا ١،٥ بەرز دەبێتەوە گوڵی ڕەنگاو ڕەنگ دەگرێ گەڵای پانە ڕەگی کروك دارە.

تەنگەژی - دارچوگە - چواڵە تاڵە (لوز البری):- چوالە تا لە بادامە تاڵەیشی پێ دەڵێن لە بارەی دەرمانیەوە کەڵکی لێ وەردەگیرێ نیمچە درختە لە شاخەکان دەڕوێت گەڵای وردە لاسکی درکاویە .

شوید - شوێتە (شبت):- لەسە رشێوەی رازیانە سودی دەرمانی زۆرە گیایەکی ئاویە بۆنی خۆشە.

گوێژە عەرەبی(جوگـه حجـازی)( خرنـوب مصـری):- ئەم درەختە درکەزیشی پێ دەڵێن ئاوی ڕەگەکەی بۆ برین باشە، چەند مەترێك بەرزدەبێتـەوە لاسـکەکەی درکاویـە گـەڵای پـان و وردە.

ترچك -گیا گونگ (هیلون):- بۆ ئالفی ئاژەڵ بە سوودە .

گوڵە ئاوات - گوڵـه میمـون (انـف الثـور):- چـەند جۆری هەیە لەناوچەی سەردەشت پێی دەڵێن گوڵە شفا سودی زۆرە تا ٦٠ سم بەرزدەبێتەوە گوڵی موز دەگرێ .

کەرەس - کـەرەوز (کرفـس):- لـەلای سەوزە فرۆشـەکاندا زۆر دەبینـرێ کەڵکی دەرمانی لێ وەردەگیرێ .

بیبونـه زەردە (بـابونج اصفـر):- باشترین جۆری دەرمانە بۆ التهـاباتی داخلـی و پـەڕی گوڵەکـەی و نـاو پـەڕی گوڵەکـەی زەردە لـە میحرابـی سـەردەشت دا زۆرە خـەڵکی گونـدی سەردەشت پێی دەڵێن بەیبون .

گوڵە مینا - گوڵنیشـا (زهـر الربیـع):-ئەم گیایە لەناو مێرگدا دەڕوێ لە قەراخی جۆگاو چەمدا، پێی دەڵێن مینای پەمەنی سـودی دەرمـانی زۆرە، لـە باخچـەی ماڵدا دەبینـی گیایەکی ئاویە گەڵای وردە.

زەل - قامیشی (جکن نهری):-لە ناوچەمو ڕوبارەکاندا دەڕوێ بە تایبەت زرێباری مەریوان بۆ سوداوی سوودی لێ وەردەگیرێ .

شەلغم :- لە کوردستانـدا زۆری لێ بەرهەم دێنن گەڵای پانڕشینە لە شێوەی تورە.

گوڵکە ئاوی (اللباو):-لەلاجەکان ساڵانە بەرهەمی دێنن .

مێوە مارانە (عنب الحیة):- لە گوێی چەمو ڕوبارەکاندا دەڕوێت لە سەر شێوەی مێوە بۆیە پێی دەڵێن مێوە مارانە، سودی دەرمانی هەیە گەڵای وەکو گەڵای مێو وایە.

قارچکە گیا خۆراکی (فطر):ئەم قارچکە بۆ خواردن سـودی لێ وەردەگیرێ لـە ناوگیـادا دەڕوێت ڕەنگی سپیە.

قتـاولی (شـلجم لسـبری):-گوڵـی زەردە لەسـەر شـێوەی خەرتەلەیـە سـودی دەرمـانی لێ وەردەگیرێ لەهەمو جێگایەکی کوردستاندا هەیە ٧٠ سم بەرزدەبێتەوە گەڵای پانە و وەکو تور وایە.

بلوبر (ذیل الثعلب):- سودی نیه .

چەوەندەر (بَنجَر):- لە بارەی دەرمانیەوە سودی لێ وەردەگیرێ لە ٨٠٪ ڤیتامین تێدایە بەڵام بۆ شەکرە باش نیە خوێن زۆر دەکات گەڵای پانە و گەڵاکەی سورە بنەکەی ٥٠٠ غم دەبێت.

گوڵە هەڵاڵە (رأس الطيار):- گوڵی رەنگاو رەنگە سودی دەرمانی زۆرە لەسەر شێوەی گوڵە مێرۆیە و گوڵی وردن لە گوێی چەم و ڕوبارەکاندا دەڕوێت گەڵای پانەیەک مەتر بەرز دەبێتەوە.

گوێزەبان (لسان الثور):- لە بارەی دەرمانیەوە سودی زۆرە لە هەمو جێگایەکی کوردستانە هەیە گەڵای پانەو دڕکاویە گوڵی مۆر دەگرێ تامی گوڵەکەی شیرینە لەلای هەمو کەسێک ناسراوە بە گوێزەبان بەڵام گاوزبانە.

گیا سەوداوی - گیا ئاڵوش (شوكت اليهود):- ئەم گیا لەسەر شێوەی گوێزبانە گیاوەیەکە کەی سودی لێ وەردەگیرێ گەڵای پانە تا ٦٠ سم بەرز دەبێتەوە لاسلکەکەی دڕکی وردی هەیە.

قامیشی گەرمیان (حەیزەران):- دار حەیزەرانی پێ دەڵێن.

کەلەم گوڵی: سودی دەرمانی هەیە لە کوردستاندا زۆرە گیایەکی ئاویە گەڵای پانەو بە کۆمەڵە.

تۆپە کەلەم (كُرُنب):- مادەی کالیسیۆمی زۆرە (ڤیتامین C.D.K) تێدایە.

ترێ ڕەشە (عود الريح):- بلفی ترێ یان باخی مێوی پێ دەڵێن ترێ چەن جۆری هەیە و ئاوەکەی بۆ هەمو جۆرە نەخۆشیەک سودی هەیە.

ڕێحانە کێویلە (ريحان البري):- گیایەکی بۆن خۆشە گوڵی مۆر و سپی دەگرێ لە بارەی دەرمانەوە سودی زۆرە ئەم گیا لە دێم دا دەڕوێت گەڵای پانە و تا ٤٠ سم بەرز دەبێتەوە.

هەمیشە بەهار (الزبيدة):- ٣٠ سم بەرز دەبێتەوە گەڵای پانە لاسلکی باریکە گوڵی زەردە کەڵکی دەرمانی زۆرە لە دەشت و دەریش دەڕوێ وەماڵی کراوە گیایەکی ئاویە.

خەیار چەمەر (قثوس):- لەسەر شێوەی ترۆزیە سودی دەرمانی هەیە.

کوڵەشێتە دێلی (قرع بري):- بۆ هەندێ نەخۆشی سودی لێ وەردەگیرێ گیایەکی وشکە گەڵای پانە.

کولەکە زەردە (قرع عَسَلي):- ئەم جۆرە کولەکە بۆ بەردی گورچیلە سودی لێ وەردەگیرێ ئاوەکەی دەخورێتەوە بۆ چارەسەر گەڵای پانەو گوڵی زەردە وشکە بەزەویدا بڵاودەبێتەوە.

**زیرەی سەوز (کمون أرمنی):-** زیرە سودی دەرمانی زۆرە زیرەی ڕەشیش هەیە و شێوەیان لە یەکە بەڵام زیرەی ڕەش بەهێز ترە تا ٧٠ سم بەرز دەبێتەوە گیای وردە هاوین تۆو دەکات.

**ڕەشە دەرمان (سماد):-** نیمچە درختە گەڵاکەی وەکو گەڵای مۆرد وایە لە ناوچەی دۆکان زۆرە گەڵاکەی وشك دەکرێ گیایەکی دێمی یە.

**گوڵە عەرعەر/گوڵە ئاگرین (شجرە مریم):-** گیایەکی یەك ساڵەیە سودی دەرمانی لێ وەردەگیرێ لاسکی باریکەو گوڵی زەنگۆڵیە ، لەسەر شێوەی وەنەوشەیە لە ئاخر مانگی بەهاردا وشك دەبێت .

**علی بابا (بادام أرضي):-** کەڵکی دەرمانی لێ وەردەگیرێ بەروبومەکەی بەرگەڕەیە گەڵاکەی وردو پانە ٥٠ سم بەرزدەبێتەوە .

**کنگر فرنگی (خرشوف):-** سودی دەرمانی زۆرە وە لە هەمو جێگایەکی کوردستاندا کەڵکی لێ وەردەگیرێ .

**قەیسە کوژ- تەرەتیزەی کێوی (حشیشە الجدی):-** لە ڕەسەنی تەرەتیزە یە تەمەنی کەم و زۆر پیر دەبێ سودی دەرمانی هەیە کەڵکی لێ وەردەگیرێ لاسکی باریکی هەیە گەڵای گیاکەی وردە تامی توندە.

**قاقلە دیمی (قرطم بري):-** گوڵی زەردو بون خۆشە سودی دەرمانی زۆرە لە شاخەکانی بەرانان و ناوچەی مەریوان گوندی سەرەدەشت دەست دەکەوێت تا (١)م بەرزدەبێتەوە گیاو گەڵای وردە.

**قاقلی (قرطم):-** لە بارەی دەرمانیەوە وەکو قاقلە دێمی وایە دڵ بەهێز دەکات ڕەنگی زەردە ماڵی کراوە.

**سەنای مەکی (سنامکی):-** وەکو گەڵای دڕ مەلهەم وایە سودی دەرمانی زۆرە بومی عەربستانە وەکو بەڵەك وایە گیایەکی دێمیە لە ناوچە گەرمەسیرەکاندا دەڕوێت.

**گوڵە داودی (أرویا):-** گوڵێکی زینەتی و جوانە ماڵی کراوە مەلهەمی لێدروست دەکرێت گەڵای وردو پانە پایز گوڵ دەکات ٧٠ سم بەرز دەبێتەوە گەڵای دوو قاتە.

**پەنجە داڵ/گوڵە ئارام (فروق حفر):-** ٨٠ سم بەرزە گوڵی زەردە هەمو گیاکە کەڵکی دەرمانی لێ وەردەگیرێ تۆوەکەی لەسەر شێوەی پولکە مارنە وایە بە بنج دەڕوێت.

**وج : پیرە گیا (أزیە) لەبان :-** بە زمانی سۆرانی پێی دەڵێن لە بانە بڕ سوداوی سودی لێ وەردەگیرێ .

زیرەی سەوز (کمون أرمنی):- زیرە سودی دەرمانی زۆرە زیرەی ڕەشیش هەیە و شێوەیا لە یەکە بەڵام زیرەی ڕەش بەهێز ترە تا ٧٠ سم بەرز دەبێتەوە گیای وردە هاوڕێ تۆودەکات.

ڕیشە دەرمان (سپار):- نیمچە درختە گەڵاکەی وەکو گەڵای مۆرد وایە لە ناوچەی دوکا زۆرە گەڵاکەی وشك دەکرێ گیایەکی دێمی یە.

گوڵە عەرعەر/گوڵە ئاگرین (شجرە مریم):- گیایەکی یەك ساڵەیە سودی دەرمانی لێ وەردەگیرێ لاسکی باریکەو گوڵی زەنگوڵیە ، لەسەر شێوەی وەنەوشەیە لە ئاخر مانگ بەهاردا وشك دەبێت .

علی بابا (بادام أرضی):- کەڵکی دەرمانی لێ وەردەگیرێ بەروبومەکەی بەرگەوەیە گەڵاکەی وردو پانە ٥٠ سم بەرزدەبێتەوە .

کنگر فرنگی (خرشوف):- سودی دەرمانی زۆرە وە لە هەمو جێگایەکی کوردستاندا کەڵکی لێ وەردەگیرێ .

قەیسە کوژ- تەرەتیزەی کێوی (حشیشە البدی):- لە ڕەسەنی تەرەتیزە یە تەمەنی کەم و زۆ پیر دەبێ سودی دەرمانی هەیە کەڵکی لێ وەردەگیرێ لاسلکی باریکی هەیە گەڵای گیاکەی وردە تامی توندە.

قاقلە دیمی (قرطم بري):- گوڵی زەردو بون خۆشە سودی دەرمانی زۆرە لە شاخەکانی بەرانان و ناوچەی مەریوان گوندی سەردەشێ دەست دەکەوێت تا (١) م بەرزدەبێتەوە گیاو گەڵای وردە.

قاقڵی (قرطم):- لە بارەی دەرمانیەوە وەکو قاقڵە دێمی وایە دڵ بەهێز دەکات ڕەنگی زەردە ماڵی کراوە.

سەنای مەکی (سنامکی):- وەکو گەڵای دار مەڵهەم وایە سودی دەرمانی زۆرە بومی عەربستانە وەکو بەڵەك وایە گیایەکی دێمیە لە ناوچە گەرمەسیرەکاندا دەڕوێت.

گوڵە داودی (أرویا):- گوڵێکی زینەتی و جوانە ماڵی کراوە مەڵهەمی لێدروست دەکرێت گەڵای وردو پانە پایز گوڵ دەکات ٧٠ سم بەرز دەبێتەوە گەڵای دوو فاقە.

پەنجە داڵ/گوڵە ئارام (فروق صفر):- ٨٠ سم بەرزەگوڵی زەردە هەمو گیاکە کەڵکی دەرمانی لێ وەردەگیرێ تۆوەکەی لەسەر شێوەی پولکە مارانە وایە بە بنچ دەڕوێت.

وع : پیرە گیا (أزیە) لەبان :- بە زمانی سورانی پێی دەڵێن لە بادە سودلوی سودی لێ وەردەگیرێ .

هەلالەی ماركوژ (كزبرة الثعلب):- ئەم گیایە ژاراویە بە هیچ شێوەیەك بۆ خواردن كەڵكی لێ وەرنەگرن كوشندەیە قەدەكەی تا ٦٠ سم بەرزدەبێتەوە گوڵی زەردە گەڵا و گیاكەی پانە و دوفاڵە.

خەرنوك - پاكە متیار (خرنوب):- گیایەكی یەك ساڵەیە سودی دەرمانی لێ وەردەگیرێ گەڵای وردو دركاویە رەنگی شینە.

چقە چقە (هند باو):- كاسنیشی پێ دەڵێن لە بارەی دەرمانەوە زۆر بەسودە بۆ هەمو حەكیمێك پێویستە، شلا بەخشە لە كوردستاندا زۆرە بە تایبەتی لە مەریوان، گەڵاكەی پانە و دركی وردی هەیە گوڵی زەرد دەگرێ تۆوەكەی وردە.

گزیژ -بلع (كیالك- الزالك):- لە كوردستاندا زۆرە، سودی دەرمانی زۆرە، درەختە بە ئەندازەی درەختی بەرو بەرز دەبێتەوە لە هەوراماندا زۆرە، گەڵاكەی پانە و دوفاڵە وەكو پێی مراوی وایە.

قەلەمار (كبار -كبر):- گیایەكی یەك ساڵەیە لە زۆر شوێنی كوردستاندا دەروێت سودی دەرمانی زۆرە.

شەوبێن، گوڵە رەنگین (فل الكارولینا):- ئەم گوڵە زینەتیە ماڵی كراوە، گیایەكی ناوییە تا ٥٠ سم بەرز دەبێتەوە.

گوڵە پیالە:- ئەم گوڵە سودی دەرمانی زۆرە لە كوردستاندا لە شاخەكانی بەمۆ و سەرتەك و جوانرۆ دەست دەكەوێت.

دارچینی (شجر سینی):- تونكلی سودی لێ وەردەگیرێ بۆ زۆربەی نەخۆشی مرۆڤ، ئەم درەختە لە (سین) و (ئەندەنوسیا) هەیە

نیلوفەر (شب النهار):- ئەم گیا لاولاوی ئاویە بۆ مرۆڤ بە سودە كەڵكی دەرمانی لێ وەردەگیرێ لەناو ئاودا دەروێت گوڵی مۆرو سپی و زەردە، گەڵای پانە بەسەر ئاودا بڵاو دەبێتەوە باشترین دەرمانە بۆ نەخۆشی (یرقان) زەردوویی لە ناو گۆماوەكاندا دەروێت.

گوڵە نێوە (شاهبانج):- ئادانەیشی پێ دەڵێن لە بارەی جوانیەوە و سودی زۆرە، لە گوێی چەم و جێگای شێدار دا ... دەروێت ١,٥ بەرزە، گوڵی زەرد، گەڵای وردە و لاسكی چوار گۆشەیە.

گیا چەوانە (كیس الراعی):- لە هەمو جێگایەكی كوردستاندا هەیە، كەڵكی دەرمانی زۆرە (٤٠ سم تا ٦٠) بەرزە تۆوەكەی وردە.

بیبەر (فلفل حار):- بۆ نەخۆشی مرۆڤ سودی لێ وەردەگیرێ،خواردنی زۆر بەسودە،گەڵای وەکو گەڵای بی وایە.

گوڵە پایزە (خمل):- گوڵی سپیە، گەڵای دریژە، بە زەویدا دەخشێ، سودی دەرمانی هەیە لە شێوە نێرگسە.

لیمۆی شیرین (لیمو حلو):- خوێن پاك دەكاتەوە،سودی زۆرە بۆ مرۆڤ، درەختە ٥-٧ م بەرز دەبێتەوە،گەڵای پانە.

لیمۆی ترش (لیمو تڵخ):- لە بارەی دەرمانیەوە سودی زۆرە، چارەسەری جۆرەها نەخۆشی دەکات.

دار نارگیل (نارجیل):- زۆر بەسودە بۆ مرۆڤ .

دارقاوە (بن قهوە):- درەختێکی گەرمە سێرییە لە ئەمریکا،لە عەرەبستان و افریقیا هەیە سودی دەرمانی هەیە.

لاولاو - دارپیچ (لبلاب):- ئەم گیایە لاولاوی بە... سودی دەرمانی زۆر لە ناو جارە گەنمدا دەروێ گوڵی مۆرە و سپی، بەزەویدا بڵاو دەبێتەوە،وشکە گەڵای پانە،لاسلکی باریکە گوڵی وەکو گوڵە لاولاوی ماڵە وایە.

پیاز خۆگانە - پیازە شورع (سورنجان):- بۆ برینو دومەڵ سودی لێوەردەگیرێ ، پیازە مارانەشی پێ دەڵێن تا ٣٠سم بەرزدەبێتەوە،گەڵای گیاکەی باریك و دریژە بەم لاولای خۆیدا دەکەوێ.

گۆیژە کێوی (زعرور الجبلیه):- بۆ دەرمان سودی زۆرە کەڵکی لێ وەردەگیرێ لە زۆر شوێنی کوردستاندا هەیە و ناوبراوە، ئەم درەختە تا ٥ م بەرزدەبێتەوە گەڵای وردو پانە و دوفاقی هەیە وەکو پەڕی مراوی وایە بەڵام وردە چەند جۆری هەیە،(گۆیژە ڕەشە گۆیژە زەردە گۆیژە سورە)هەمویان لەبارەی دەرمانیەوە سودیان زۆرە گەڵا و گوڵ و میوەکەی سودی لێ وەردەگیرێ ، وە ڕەگەکەی بۆ مەڵهەم سودی لێ وەردەگیرێ.

کاڵەك (بطیخ):- تەبیعەتی ساردە،بۆ حەرارەتی خوێن سودی زۆرە،سودی دەرمانی هەیە ناوکەکەی.

سپێناخ (أسفناخ):- گیایەکە تا ٥٠ سم بەرز دەبێتەوە،سودی زۆرە، سودی دەرمانی هەیە، گەڵاکەی پانە و تۆوەکەی وردە.

شوتی - شامی (رگی):- لە بارەی دەرمانیەوە سودی زۆرە لە ناوکو پێستەکەی کەڵك وەردەگیرێ.

بەهێ - بەی (سفرجل):- بە میوەی بەهەشتێ ناسراوە لە بارەی دەرمانیەوە زۆر زۆر بەسوودە .درەختەکە گەڵای پانە.

کالۆس - گوڵە خەپلە (صُبَع):- درکێکی زینەتیەرمالی کراوە زیانە خەسویش پێی دەڵێن لەسەر شێوەی زمانی گایە.

درکە بولینە - درکەکەوە (شوکة عنار):- ئەم گیادرکە مادەی جیوە و نقری تێدایە زۆر بەسوودە لە کوردستاندا زۆرە بۆبرینی سوداوی عَفُونی مەلهەمی لێ دروست دەکرێ تا ۸۰ سم بەرزدەبیتەوە لە دێم دا دەرووێت.

تاولی - گژلیژ - (گُزبَرَه):- لە بارەی دەرمانیەوە وە سودی زۆرە لە کوردستاندا زۆری لێ دەرووێن.

گەنە گەنە - پاوکوژ - دەرمانە لەرز (کینین):- ئەم درختە لە ناوچەی دەریەبەندیخان کەلار پێی دەڵێن دەرمانە لەرز لە بارەی دەرمانیەوە و سودی زۆرە درەختە شێوەی وەك بی وایە ٤ م بەرزدەبێتەوە.

شەوبۆ - گیایەن (خیری اصفر):- تا ٤٠ سم بەرزدەبێتەوە وە رەنگی جوانە گوڵی زەردو مۆر دەکرێ گەڵای پانە سودی دەرمانی زۆرە گیایەکی دێمیە لەزەویە بایەرەکاندا دەروێت ناخر مانگی بەهار گوڵ دەکات.

گوڵە کاویان - گوڵە فەرهاد (شـراع):- چەند جۆری هەیە مالی کراوە دەشتیشی هەیە لە بارەی دەرمانیەوە سودی لێ وەردەگیرێ .

دارقنلق (جلـوز):- درختە لە بارەی دەرمانیەوە سودی لێ وەردەگیرێ گەڵای پانە و میوەکەی لە شێوەی بادامەبەلام خرە.

داردەماغ - سەرو (سرو):- درەختێکی کێویە لەرەگەکەی مەلهەم دروست دەکرێت بۆ (جزامی)گولی .

هەرێز - (نَجیر):- ئەم گیایە لە وڵاتی کوردستان زۆرە بەزەویدا بڵاودەبێتەوە سودی دەرمانی زۆرە بۆ مروڤ گەڵای گیاکەی وردو باریکە گیایەکی ناویە لە ناوزەرعاتەکاندا زۆرەوجوتیار رقی لێ یەتی.

گوڵە ئاگرین گوڵە عەرعەر (بُخورمریم):- گوڵێکی زینەتیە مالی کراوە لە شاخیش دا هەیە.

بەردشکێن بەلەخدار (خراز):- ئەم گیایە قوزەی پێ دەڵێن لە بارەی دەرمانیەوە سودی زۆرە لەسەر بەرزدەبێت.

گوێژ (خیزاصفر ):- ئەم ڕووەکە سودی دەرمانی زۆرە لە کوردستاندا دەڕوێ چەند جۆری هەیە سپی و زەردو مۆر ٢٠ سم بەرزە گەڵای پانە لاسکی سەوزە لە ئاخر مانگی بەهاردا گوڵ دەگرێ.

نۆك ( حمص ):- نۆك بۆ خواردنی ڕۆژانە مرۆڤ سودی لێ وەردەگرێ .

گاکوژە - گا کوال (قاتل البقر ) :-ئەم گیایە یەك مەتر بەرز دەبێتەوە و گوڵی سپی دەگرێ لە پاشان ئەو گوڵە دەبێ بە دڕك دێمی ناوی هەیە دڕکی وەکو نوسەنەك وایە ژارلویە بۆ خواردن نابێت.

شێر وشك (شوك رضوان ):- درەختێکە لە سەر شێوەی مۆرد بەری وەکو بەری مۆرد وایە تا ٣م بەرز دەبێتەوە لە سلێمانی لە باغی گشتی دا دەبینرێت بەرچاو دەکەوێت گەڵای وردو پانی هەیە.

پرتەقاڵ (برتقـــال ) :-درەختێکە میوەکەی بۆ مرۆڤ سودی زۆرە خەڵکی دەرمانی لێ وەردەگرێ هەر لەسەر شێوەی پرتەقاڵە .

دار نارنج (نارنج ):- درەختێکە بۆ زۆربەی نەخۆشیەکان خەڵکی لێ وەردەگرێ .

دار نارنگی (یوسف افندی ):- درەختێکە وەکو پرتەقاڵ وایە سودی زۆرە بۆ مرۆڤ .

ئـالف پیـچ ئەتیمـون (دواء الجنـون ):- لـە بـارەی دەرمانیەوە سـودی لێ وەردەگیرێ خـۆی دەئاڵێنێ بە گیادارگیایی بەهێز دەکات و ڕەگی نابینرێت ئەم گیایە وەکو تاڵە بەکرە وایە ڕەگەکەی نابینرێت و خۆ دەئاڵێنێت بە گیادا.

زەعفەران (زعفــران ):- سـودی دەرمـانی زۆرە،زۆر بـە نرخـەو گوڵـی زەردە تـا ٣٠ گەز بەرز دەبێتەوە وەکو گوڵە نێرگس وایە.

گوڵە مێخەك (قرنفل ):- ئەم گیا سودی دەرمانی زۆرە گوڵی سپی و ڕەشە تا ٤٠ سم بەرز دەبێتەوە دو جۆری هەیـە گـەڵای گیاکـەی وردو باریکـە گوڵـی ڕەنگاو ڕەنـگ دەگرێـت و لاسلکی پڕەمووش نیە.

ئەسپون - صابونی (قرنفل بــری ) ئەسـپون:- بۆ مەڵهەم بەکار دێت سودی لێ وەردەگیرێت جێگای سابون دەگرێت ئەم گیایە ڕەگەکـەی لـە بـارەی دەرمانیەوە سـودی لێ وەردەگیرێ لەلای خەڵکی ناسراوە.

کاسە گوڵ (زهـرالکشـاتیین):- ئەم گیایە لە کوردستاندا زۆرە لە پێدەشتەکانی دەڕوێت سودی دەرمانی زۆرە ٧٠ سم بەرز دەبێتەوە لە ئاخر مانگی بەهاردا وشك دەبێت.

گیا مشك (مـازیون):- گوڵی بە کۆمەڵ دەگرێ گوڵی زەردە گەڵای لە شێوەی گوێ مشکە سودی دەرمانی هەیە .

گوڵە ئاڵۆز (خالف وأنبار):- گیایەکی یەك ساڵە لە شاخ و دەشتدا دەڕوێت بۆ نەخۆشی (کبد)جگەر سودی زۆرە گوڵی وردو سپی دەگرێ گوڵی زەنگۆڵەیی‌یە بۆنی‌زۆر خۆشە.

کـەما (شجرة الإشـق):- کـەما لـە بـارەی دەرمانیەوە سـودی زۆرە لـە شـاخی میحرابـی و دەرەبیان گوندی سەردۆش سەر بە شاری مەریوان زۆرە گەڵای گیاکەی وەك گەڵای شویت وایە بۆنی توندو تیژە.

تەرپی – تەرو (صف صاف الذئب):- درەختێکە لە شاخەکاندا دەڕوێت تا ٢ م بەرزدەبێتـەوە میوەی وردو زەردن لـە بارەیدەرمانـەوە سـودی لێ وەردەگیرێ گـەڵای وەکـو گـەڵای بـی وایـە بەڵام وردو پتەوترە .

ڕیشە کەما (أسعد البری):- گیایەکی یەك ساڵەیە سودی دەرمـانی هەیە بۆ برینـی عفونـەت

کەوکـەو (کهیلـه):- گوڵێکی زۆر جوانە بۆ زینەت ماڵی کراوە بـۆ دەرمـانیش سـودی لێ وەردەگیرێ.

گـێژەر:- بەفارسـی هـەویج‌پێ دەڵێن سودی زۆرە ڤیتامین (A.K) تێدایە گیاکەی وەکو گیای جەعفەری وایە.

ئۆکالیتوس (أوكاليبتوس):- ئەم ڕووەکە تا ١,٥ م بەرز دەبێتەوە سودی دەرمانی زۆرە .

دارژالویا (علف):-ئەم درەختەسودی دەرمانی زۆری هەیەولە کوردستاندا دەڕوێت لە سەر شێوەی درختچیە لە کێوی هەیبەت سوڵتان لە نزیکی شارۆچکەی کۆیەدا دەبینرێت لەناو شاخو بەردەکاندا چوار فەسڵە سەوزە و ڕەنگی جوانی هەیە وەکو شولە بی وایە لەسەر بنجی خۆی دەڕوێت.

گیا ئیر – شفتە ژێ (پەنۆع):- لەسەر شێوەی خۆژیلکە بۆ برین کەلکی لێ وەردەگیرێ ەشیری هەیە ٣٠ سم بەرز دەبێتـەوە گەڵای وردی پـانی هەیـە و ئـاخر مـانگی بـەهار تـۆو دەکـات تۆوەکەی خڕە.

# ناوی هەندێك لە گوڵ و گیا



خوژە- گیا دوخەوا( سرێش)



توتن کێوی _ گوشەنەوە



قارچکە گوڵان _ کارگی کێوە



بۆژانە کێویلکە



گوڵە ئاگرین



گویژە عەرەب



قاقلە دیمی



دەرمانە ئازار



گوڵە عەرعەر



زیرەی سەوز



گیامەلحەم



کەرموز



گەنەگەنە - باوکوژ



قەیتەران- سەفرابەر



زەردە شابەنگ - بوژانە




گولە داودی



گولەکە زەردە



گولە مینا



ڤاقلی



بەیبونە زەردە



خرنوک- پاکەمتیار



خیارەچەمەر



کاشمە



گوڵە هێرۆ



سەنای مەکی



کنگر



قناولی



پێچکە



بەیبونە رۆمی



کەوەر



تۆپەکەڵەم



گوڵە نەستێرە



بەردەگیا



ترچك



گوڵەجام



گیامشك





زەعفەران



گوڵەلیوە



دار ژانوبا



پیازەخوگانە



گوڵە پیاڵە



کاسەگوڵ



کاتوس - گوڵەخەپلە



گیاچاوانە



هەلایەل



کنیواڵ



تەنگەزی - چواڵە تاڵە



تەماتەمارانە



نوکالیپتۆس



شەوبۆ ـگیابەن



گوڵەهەزار



ترێ رەشە



لاولاو



بەرزە لەنگ



کەرکوڵ



چواڵە لوسە

تەواو بوو
والحمدلله رب العالمين

# ناوەرۆک

| بابەت | لاپەرە |
|---|---|



لای ڕاست وێنەی نووسەر (فایق محمد) ، لای چەپ وێنەی منداڵێکە خەڵکی کانی کوردەیەو تووشی نەخۆشی کەچەڵی بووە ، بەلام ئێستا چاک بووەتەوە بەهۆی دەرمانکردن بەگوڵ وگیا لەلایەن کاک فایەقەوە .



ئەمە وێنەی منداڵێکە ماڵیان لەکانی کوردەیەو پاش ئەوەی گیرۆدەببوو بەنەخۆشی ئیفلیجی ، ئێستا چاک بووەتەوە بەهۆی دەرمانی کوردەواری (بەگوڵ و گیا) لەلایەن کاک (فایەق) .

**ژمارەی سپاردن ( ٤٥٧ ) پێ دراوە ساڵی ١٩٩٩زایینی لەلایەن وەزارەتی رۆشنبیری**

تێبینی: بۆ زیاتر شارەزابوونتان لەبارەی ئەم کتێبەوە ، ئەتوانن پەیوەندی بکەن بە کاک( فایەق محمد)لە ڕێگەی (ابوبکر محمد)برای کاک (فایەق) بەم ناونیشانە : «سلێمانی / کانی کوردە ، ئاخر مەوقیفی پاسەکانی کانی کوردە».